کارۆلین جیسوب

# دەربازبوون

# ESCAPE

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە:

شێرزاد هەینی

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
شەقامی گوڵان - هەولێر
هەرێمی کوردستانی عێراق
هەگبەی ئەلیکترۆنی aras@araspress.com
وارگەی ئینتەرنێت www.araspublishers.com
تەلەفۆن: 00964 (0) 66 224 49 35
دەزگای ئاراس لە ٢٨ تشرین (٢) ١٩٩٨ هاتووەتە دامەزران

کارۆلین جیسوب
دەربازبوون
وەرگێڕان و ئامادەکردنی بۆ عەرەبی: محەمەد ئەمین
وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: شێرزاد هەینی
کتێبی ئاراس ژمارە: ١١٣٣
چاپی یەکەم ٢٠١١
تیراژ: ٦٠٠ دانە
چاپخانەی ئاراس - هەولێر
ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ٦١١ - ٢٠١١
نەخشاندنی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
رازاندنەوەی بەرگ: مریەم موتەقییان
هەڵەگری: بۆکان نووری

## وتەیەکی کورت

ئەو کتێبە گێڕانەوەی بەسەرهاتی ژنێکە کە لە ناو تایفەیەکی تایبەتی باوەڕدار لە Fundamentalist Church of Jesus Christ of Latter Day Saints لە ئەمەریکا ژیاوە و پاشان لەوان یاخی بووە و خۆی لەوان دەرباز کردووە و راستگۆیانە و بە زمانێکی سادە رۆژانە نەریتەکانی ئەو کۆمەڵەیەی نووسیوەتەوە. ئەو لە رۆژی ١ی ینایری ساڵی ١٩٦٨ لە دایک بووە و لەبەر خوێندن دەریان هێناوە و بەزۆر شووی بە پیاوێکی تایفەکەی خۆیان کردووە کە سێ ژنی تری هەبووە و هەشت منداڵی لەو پیاوە بووە. لەو کتێبەدا هەموو لایەنەکانی ئەو کۆمەڵەیەی ئازایانە هێناوەتە زمان، ئەو تا ساڵی ٢٠٠٣ لە ناو ئەو کۆمەڵگەیەکەدا بە کولەمەرگی ژیاوە. وەرگێڕان و ئامادەکراوی کتێبەکە لە رۆژانی ٢ تا ٨ی فبرایەر لە رۆژنامەی ئەلقەبەسی کوێتی بڵاو کراوەتەوە. منیش بەپێویستم زانی ئەو کتێبە وەربگێڕمە سەر زمانی کوردی، تا ئەو کۆمەڵەیەش لەلایەن ئێمەوە و لەسەر زاری ئەو ژنە بناسرێت.

شێرزاد هەینی – ستۆکهۆلم

ینایەری ساڵی ٢٠١٠




بەرگی کتێبەکە بەزمانی ئینگلیزی

## پێشەکی

کتێبی (ئیسکێپ) واتە دەربازبوون و هەڵاتن، چیرۆکێکی ئەفسانەیی کۆمەڵگەیەک نییە کە لە سەدە کۆنەکاندا ژیابن، یان سەربردە و گێڕانەوەی عەشیرەتێک نییە بێشەڵانە چڕەکانی ئەفریقیا یان دارستانە چڕەکانی ئەمازۆن نیشتمانیان بوبێت، ئەو کتێبە حیکایەتی تایفەیەکە لەو سەردەمەدا دەژین، لە ناو جیهانێکی ئازادی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا دەژین.

لەو ناوچەیەی دەکەوێتە نێوان ویلایەتی ئریزونا و یوتا، تایفەیەکی گچکە کە سەرژمێریان ناگاتە دەیان هەزار کەس لەو دەڤەرەدا بوونیان هەیە و دەژین، ئەوان پابەندن بە یەکێک لە ڕێنوێنییەکانی کڵێسەیەکی دوورەپەرێزی لاچەپ، ناوەکەیان بە کورتکراوەیی FLDS یە.

ئەو کۆمەڵە سرووتی تایبەتییان هەیە، داوونەریتەکانیان زۆر نامۆیە و لەگەڵ یاساکانی ئەمەریکیایدا یەک ناگرنەوە و دوورن لەیەک، دەسەڵاتدارانی ئەمەریکاش چاوی لێ پۆشیوون و لە بەدکارییەکانیاندا بێدەنگە.

ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە گوێڕایەڵی سەرکردەکەیانن، کە پیرۆزییەکی زۆر مەزنی لە ناو ئەواندا هەیە، ئەوەندە پیرۆزە تا ڕادەیەک بە (پێغەمبەر!) ناوی دەبەن. ئەو پێغەمبەرە پیرۆزە بۆی هەیە ژمارەیەکی زۆر ژن بهێنێت، حەزی لە کێ بوبێت بەئاسانی بوویتە هاوسەری، دەڵێن ژمارەی ژنەکانی جاری وا هەبووە گەیشتووتە حەفتا ژن، زۆربەی ئەو ژنانەش تەمەنیان گچکە بووە، واتە پێغەمبەرەکەیان تەنیا کیژە گچکەکان لە خۆیان حەڵال کردووە.

هاوسەر دەستنیشانکردن و هاوسەرگیرییەکانی ناو ئەو کۆمەڵە ئاینییە بەدەست کەسە پێغەمبەرەکەیە، هەر ئەویش موبارەکییان پێ دەڵێت، دەسەڵاتی ئەوەشی هەیە کێ لە کێ حەرام بکات، واتە حەڵال و حەرامی ژنەکان بەدەست

خۆیەتی. یەکێک لە سیما و نەریتەکانی ئەو کۆمەڵە ئاینییە فرە ژنییە، ئەو دیاردەیەش هیچ کۆت و پێوەندیی نییە، پیاو بۆی هەیە پازدە ژن لە یەک کاتدا بکاتە هاوسەری خۆی، لەو ژنانە دەکرێ خوشکیش بن، بۆیەش نەوەکانیان زۆرە و لە ناو یەک خێزاندا ژمارەی منداڵەکان گەیشتووتە نزیکەی چل منداڵ لە ناو یەکماڵدا، هەر چەند پیاوێک دەسەڵاتی لەلای پێغەمبەرەکەیان زۆرتر بێت و پێغەمبەرەکە زۆرتر ئەوی خۆش بووێت، ئەو پیاوە دەسەڵاتی هێنانی ژمارەی زۆرتری ژنانی هەیە.

لە ناو ئەو کۆمەڵەیەدا خەڵکەکە وا دەزانن جیهانی دەرەوە تەنیا دەستەیەک و جیهانێکە تەژی لە خراپەکاری و تاوان، ئەوان خەڵکەکەش بە کەسانی دوژمن ناس دەکەن و کۆشش دەکەن لەناویان بەرن و کۆمەڵەکانی تر لە بوون رەش بکەنەوە، خێزانەکانی ئەو کۆمەڵەیە منداڵەکانیان رەوانەی قوتابخانە حکوومییەکان ناکەن، چونکە ئەوان وا دەزانن مامۆستای ئەو قوتابخانانە جۆرێکن لە کەسانی موشریک و لادەر، ئەوان بەهەموو شێوەیەک بوار نادەن کتێبە دنیاییەکان بگاتە دەست منداڵەکانیان. لە ماڵەکانیاندا ئامێری تەلەڤزیۆن نییە، ئەوان بەهیچ شێوەیەک شیرنەمەنی ناخۆن، منداڵەکانیان نێر و مێیەکانیان بواریان نییە و قەدەغەیە هیچ زانیاری سێکسی بزانن، یان هیچ بابەتێک لەسەر ئەو لایەنە بخوێننەوە، تا رادەیەک کیژەکانیان تا شەوی پەردە و بووکێنی خۆیان هیچ زانیارییان لەسەر سێکس نییە، ئەوەش قسەی نووسەری کتێبەکەیە.

لەو کۆمەڵەیەدا ژنان بۆیان نییە ئۆتۆمۆبێل لێ بخورن، ئەگەر زۆر پێویست نەبێت، ئەگەر ئۆتۆمۆبێلیش لێ بخورن، ئەوا ئۆتۆمۆبێلەکانیان تابلۆی ژمارەیان نییە، یان مۆڵەتیان نییە، ئەوەش بۆ ئەوەیە تا نەتوانن رابکەن و لە کۆمەڵەکەیان دوور بکەونەوە وەک چۆن نووسەری ئەو کتێبە کردوویەتی و رای کردووە لەو ژیانە دەربازی بووە.

***

## سەرەتای هەڵاتنەکە

ئێتسا کاتی هاتووە، من ماوەی یەک مانگە بەپەرۆشەوە چاوەڕوانم، ئەو ساتە گونجاوە بۆ من، بەڵام دەبێ زۆر وریا بم، زۆر زیرەکانە هەڵسوکەوت بکەم، ئەگەرنا ئیشەکەم سەرناگرێت و فەشل دەهێنم، دیارە کەوا بەدبەختی و هەورازەڕێ نۆ روحی هەیە، کایەکی نۆ رۆحـیـیـە، ئەویش روحی هەشت منداڵەکەم و خۆمە.

کات و رۆژ دووشەمە بوو، رێکەوتی بیست و یەکی مانگی ئەپریلی ساڵی ۲۰۰۳ سەعات دەی شەو بوو، لەو دەمانەدا هەستم کرد مێردەکەم بەیانی زوو بۆ کارکردن دەرچووە، لە ماڵەوە نەماوە و درەنگ دەگەڕێتەوە، هەر هەشت منداڵەکەم لە ماڵەوە بوون، لەوانە (ئارسەر)ی تەمەن پازدە بەهارییەکەشم، ئەو منداڵی گەورەم بوو، چونکە ئەو بۆ کاری بیناسازی سەفەری دەکرد و کەم لە ماڵەوە دەبوو، بەڵام ئەو شەوە ئەویش لە ماڵەوە بوو.

بۆ ئەوەی من لەو ماڵە و لەو ژیانە نامۆییەدا رابکەم دەبووایە دوو فاکتەر ئامادەیی هەبووایە، تا بتوانم کارەکەم سەرکەوێت، ئەویش مێردەکەم لە ماڵەوە نەبێت و لە شوێنێکی دووربێت، فاکتەری دووەمیش ئەوە بوو کەوا منداڵەکانم هەموویان لەبن دەستی خۆمدا بن، بۆیەش کە ئەو دوو مەسەلەیەم لەبن دەستدا بوو، دەبووایە زوو و بەپەلە بجووڵێمەوە و ئازایانە بڕیارێکی بەلەز دەربکەم.

بژارەکە لە نێوان دوو مەسەلەیەدا لە ناو مێشکم گینگلی دەدا، یەکەمیان ئازادبوون، دووەمیشیان ترس. من ژنێکی تەمەن سی و پێنج ساڵیم و بەڕاستی لەو ژیانە بێزاربووبووم و بەرگەی ئەوەم نەمابوو لەو ماڵە و لەو رەوشەدا بژیم، دەبووایە دەربازم بێت، من لە ماڵێکدا بم مێردەکەم چەند ژنی

تری هەبێت، من تەنیا ئەو جیهانەم دەبینی، ئاگام لە جیهانی دەرەوە نەبوو. من لە کۆمەڵگەیەک دەژیام پیاو بۆیان هەبوو چەند ژنێکیان هەبێت، فرەژنی ئاسایی بوو، من چەند وەچەم لەگەڵ ئەوانەدا بەڕێ کرد، ئەو کۆمەڵگەیە بەشێکە لە تایفەیەک سەر بە کڵێسەیەکی توندڕەوی ئوسولی، کە دەکەوێتە ڕیزی پشتەوەی کڵێسە کۆنەکان، کە ناوەکەی کورتکراوەتەوە بەو پیتانە (ئێف، ئیلم دی، ئێس)بوو، سەرژمێری ئەو تایفەیە دەگاتە نزیکەی دە هەزار کەس و هەوارەکەی دەکەوێتە نێوان سنووری ویلایەتی ئریزوناو یوتا.

لە تەمەنی هەژدە ساڵییەوە بەناچاری شووم بە (میریل جیسوب) کردبوو، بە پرۆسەی (مەرەتەب) ئەو پرۆسەم لەگەڵ ئەو پیاوە تەمەن پەنجا ساڵییە کردبوو، من هەر ئەوەتە دەمناسی، من بوومە ژنی ژمارەی چوارەمی ئەو، لە ماوەی پازدە ساڵدا هەشت منداڵم لەو پیاوە بووە.

کوڕە گەورەکەم ئێستا تەمەنی پازدە ساڵە، منداڵە گچکەکەشم تەمەنی تەنیا هەشت مانگە، (هاریسون)ی کوڕم کە نەخۆشییەکی درێژخایەنی هەیە و کەمئەندامە تەمەنی چوار ساڵە، بێجگە لە کەمئەندامییەکەشی تووشی کانسەری جیهازی عەسەبیش هاتووە.

یەکەم هەنگاوم بۆ ئەوەی لەو کۆمەڵگەیە رابکەم، دەبووایە بچمە ماڵی (لیندا)ی خوشکم تا لەوێ تەلەفۆنەکەی ئەوان بەکار بهێنم، چونکە لە ماڵەکەی خۆماندا لەبەرئەوەی بەردەوام چاودێری دەکرام، نەدەکرا لە تەلەفۆنەکەماندا ئازادانە قسەی خۆم بکەم، چونکە ژنەکانی تری مێردەکەم گومانیان لە من هەبوو، ئەوان هەستیان دەکرد من لەوان سەربەخۆترم، من لەوان زۆرتر بیر دەکەمەوە و لەو ژیانەدا بێزارم، بۆیەش ئەوان بەردەوام چاویان لەسەر مندا بوو، ئەگەر هەر یەک لەو ژنانە هەستیان بە جوولەیەکی نامۆی من کردبووایە یەکسەر ئاگەداری مێردەکەمیان دەکردەوە، بەوەش میریل لە مەسەلەکە ئاگەدار دەبوو.

## ئۆردووگای گیراوەکان

خوشکەکەم لەو کۆمەڵەیەدا ئەندام بوو، ئەو دڵسۆزی FLDS بوو، بەڵام مێردەکەی ئەو ژنی زۆری نەهێنابوو، ئەو بڕوای بەو دیاردەیە نەبوو، چونکە زۆر بەیەکەوە قسەمان کردبوو، بۆیەش من ئەوەم بە کەسێکی باش دەزانی، لەو قسانەدا ئەو تێگەیشتبوو کەوا من زۆر پەرۆشم لەو رەوشەدا دەربازم بێت و رابکەم، چونکە من دەمزانی ئەو کۆمەڵەیە چەند بەرەو توندڕەویی دەچێت، لەبەر رۆشنایی و رێنوێنییەکانی پێغەمبەرە ترسناکەکە ئەوان چ جۆرە هەنگاوێک دەنێن، سەرۆکەکە ناوی لە خۆی نابوو (وارین جیفس).

لەو دەمانەی وارین جیفس (پێغەمبەرەکە) لە پاش مردنی باوکی دەبێتە سەرۆک، ئەو بانگەشەی ئەوەی دەرکرد کەوا روحی مەسیحی تێدایە، باوکی ئەو خوا بووە! ئەو بەشێوەیەکی ترسناک و تۆقێنەر باسی ئەوەی دەکرد کەوا هەوادارەکانی دەگەیەنێتەوە شوێنێک کە ناوی نابوو (شوێنە ناوەندەکە)، ئێمەش هەستمان دەکرد ئەو شوێنە ناوەندەی ئەو داواکارە، لە گرتووخانەیەک دەچێت و لەوێش دەربازبوونمان نییە.

جیفس وای دەزانی کەوا خەڵکەکە لە بۆچوونەکانیاندا سەربەست نین، بژاری تایبەتی خۆیان نییە، مێردەکەی من ئەندامێکی بەهێز و کاریگەری کۆمەڵەکە FLDS بوو، ئەو لە کەسە نزیکەکانی جیفس بوو، من ترسی ئەوەم هەبوو مێردەکەم بەخۆی و هەر حەوت ژنەکەی و ژمارەی منداڵەکانی کە دەگەیشتە پەنجا و چوار منداڵە کەسە یەکەمەکان بێت تا بگاتە جیهانە نوێیەکە، ئەو جیهانەش لە ئۆردووگایەکی گیراوەکان دەچوو، لەوێش چەند جاسووسێکی تێدایە کە بەردەوام ئەو قسانە دەگەیەننە سەرووی خۆیان، ئەوەیان بۆ هەڵدەبەستن کەوا ئەوانە رێزی (خواوەند) ناگرن، کە من منداڵبووم ئەو جۆرە توندڕەوییە لە ناو کۆمەڵەکەدا نەبوو، بەڵام (پێغەمبەر!) ئەوانەی دووبارە هێناوە ناو FLDS، واتە پاش ئەوەی وارین جیفس دەبێتە گەورەی ئەو تایفە نوێیە.

پێش ئەو پێغەبەرە نوێیە، منداڵەکانی ئەو تایفەیە دەچوونە قوتابخانە حکوومییەکان، بەڵام بەمەزندەی جیفس ئەو مامۆستایانە کەسانی موشریکن، لادەرن، ئەوانە کەسی خاوێن نین، بۆیەش جیفس فەرمان دەدات منداڵانی FLDS رەوانەی ئەو قوتابخانانە بکرێن کە لەلایەن کڵێسەکەیانەوە بەناوی PRISTHOOD SCHOOLS سەرپەرشتی دەکرێن. بە بۆچوونی پێغەبەرەکەمان جیفس، مناڵەکانی ئەوان لە تۆپیەکن لەلایەن خواوە گوڵبژێرکراون، ئێمەش کە نەوەی میللەتی خواین، پاریزگاری بکەین و بوار نەدەین بە شتی نەگریس پیس نەکرێت و بەردەوام بە خاوێنی رای گرین.

ئەو قوتابخانانەی کە لەلایەن FLDS ەوە بەڕێوە دەچن لەجیاتی ئەوەی فێریان بکەن، مێشکیان دەشووشتنەوە، لەوێ منداڵەکانی منیان فێر کردبوو کەوا دیناسۆرەکان بوونیان نەبووە و کەسیش نەچوویتە سەر مانگ، بۆیەش تێگەیشتم بۆچی ئاستی زانیارییەکانی خەڵکی تایفەکەمان وا دواکەوتووە و هیچ فێرنابن.

## تەڵە

من لە قوتابخانەیەکی گشتی مامۆستابووم، لەبەرئەوەی زۆر حەزم لە خوێندنەوەی ئەدەب بوو، بۆیە نزیکەی سێ سەد کتێبم لە ئەدەبی منداڵان کۆکردبووە، بەڵام کە جیفس دەبێتە پێغەمبەرمان و لە پاش مردنی باوکی ئەو پۆستە وەردەگرێت، بڕیارێک دەردەکات و هەموو کایە دنیاییەکان قەدەغە دەکات، لەوانە کتێبیشی قەدەغە کردبوو، بۆیەش بەکارهێنان و خوێندنەوەی کتێب لە ناو تایفەکەم قەدەغە دەبێت، دیارە کەوا مێردەکەم فەرمانەکەی پێغەمبەرەکەمان قبووڵ دەکات، بۆیەش هەموو ئەو کتێبانەی بابەتەکانیان ئەدەبی بوون دەستیان بەسەردا دەگیرێت، لەوانە کتێبەکانی منداڵەکانیشم. ئەوەی هەموومان دەمانزانی ئەوا جیفس حەزی دەکرد زۆرترین کیژە تەمەن گچکەکان بکاتە هاوسەری خۆی، هەندێ ئامار و زانیاریمان هەبوو کەوا جیفس نزیکەی حەفتا ژنی هەبووە.

ڕۆژێکیان لە نەخۆشخانەبووم کە گەڕامەوەماڵەوە چاوم گێڕا کیژە تەمەنە دوازدە بەهارییەکەم دیار نییە، کە پرسیاری زۆرم لە چارەنووسی (بیتی)ی کیژم کردبوو، لە ماڵەوە وەڵامی مەعقوڵم دەست نەکەوت، هەستم کرد داوەشاوم، لە کۆتاییدا یەکێکیان وتی، من وا دەزانم سەعات یازدەی شەو کیژەکەتیان بۆ ماڵی پێغەمبەر بانگ کرد، منیس یەکسەر پێوەندییم بەو ڕێکخراوە کرد کە یارمەتی ئەو ژنانەی دەدات کە لەدەست دیاردەی فرەژنی رادەکەن، لە تەنگاوییدا پێوەندییم بەوانەوە کرد، بەڵام بەداخەوە نەکرا بەپەلە یارمەتییم بدەن و بەفریام نەکەوتن. کە کاتەکە دەگەیشتە نیوەشەو هەستم کرد تەڵەکە دەمگرێت، من و خوشکەکەم پێوەندییمان بەو برایەمانەوە کرد کە لە شاری (سۆلت لیک) دەژیا. ئارسەری برام چوار ساڵ بوو کۆمەڵەکەی جێ هێشتبوو، ئەو ژنێکی بەخۆشەویستی هێنابوو، ئەویش کیژی زڕدایکمان بوو. باوکم ژنێکی هێنابوو هەشت منداڵی هەبوو، ئارسەری برامان حەزی لە (سیلما)ی کیژی ئەو ژنە کردبوو، بەڵام بواریان نەدەدا بیهێنێت، لەو دەمانەش پێغەمبەر بڕیار دەدات ئەو کیژە بداتە پیاوێکی تر و کیژەکەش دڵی بەو پیاوەوە نەبوو، هەر شەیدای ئارسەری برام بوو، بۆیە کیژەکە لەگەڵ ئارسەری برام رادەکەن و تایفەی FLDS جێ دەهێڵن، لەو ڕۆژەوە ئەو ژن و مێردە لە شاری سۆلت لیک بەختیار لە ماڵی خۆیاندا دەژین.

## جیهانی بەدکارەکان

کە تەلەفۆنم بۆ ئارسەر کرد، ئەو وەڵامی دامەوە و منیش بەلەز پرسیم:

ئارسەر ئەگەر من رابکەم، ئەگەر من ئیمشەو بۆی دەربچم، تۆ یارمەتیم دەدەیت؟

ئەویش لە وەڵامدا وتی:

کارۆلین کوی راکرە، لە مەبەستم تێ بگە من هەموو شتێک لەپێناوی تۆدا دەکەم، خۆت دەزانی نێوانی ڕێگەکە دوورە من تا پێنجی بەیانی ناگەمە لای تۆ، ئەوە باش دەزانیت. منیش لە وەڵامدا وتم:

کەواتە پارمەتیم دەدەیت.

کە وەڵامەکەم لە ئارسەر برامەوە بیست ویستم خۆم راگرم، رێگەکە دووربوو، نێوانمان بە ئۆتۆمۆبێل کاتی زۆری دەویست، نزیکەی سێ سەد میل دووربوو، دەبووایە هەموو شەوەکە ئۆتۆمۆبێل لێ بخورم. ئەو لە تەلەفۆنەوە بە منی وت:

خوشکم چاوەروان بە، من وا دێمە لات.

لەگەڵ براکەم رێککەوتین کەوا لە (گۆشەی کەنگمان) کە سێ میل لە شارۆچکەی دیوی ویلایەتەکە دووربوو، لە نێوان سنووری هەردوو ویلایەتی یوتا و ئریزونا بوو. ئەو وتی من لۆرییەک دەهێنم بتوانێت ڤانەکەی تۆ لە پشتەوەی راکێشم، تۆ رادەکێشم تا دەگەمە شاری سۆلت لیک. ئەوەی باش بوو ئۆتۆمۆبێلەکە بەناوی خۆم بوو. لە ناو تایفەکەماندا ژنان بۆیان هەبوو ئۆتۆمۆبێل لێ بخورن، بەڵام تابلۆی ئۆتۆمۆبێلەکان یان ماوەی کارکردنیان تێپەریبوو، یان لە ئەساسدا تابلۆ و ژمارەیان نەبوو، ئەوەش بۆ ئەوە بوو ئەگەر بەو ئۆتۆمۆبێلانە رابکەین، بەئاسانی لەلایەن پۆلیسەوە بگیرێن. ئۆتۆمۆبێلەکەی براکەم کە جۆری (سی ئو ڤی) بوو جێگەی خۆم و هەر هەشت منداڵەکەم بە ئیسراحەت دەبووەوە، بەڵام رازیکردنی منداڵەکانم ئاسان نەبوو بۆ ئەوەی لە ماڵەوە دەریان بهێنم، ئەوان ئەگەر بیانزانیبووایە ئێمە رادەکەین، ئەوان لەگەڵ مندا نەدەهاتن، ئەوان بە راکردن رازی نەبوون، دەبووایە من بیانووێکی باشم هەبێت، تا بتوانم هەموویان بەیەکەوە لە ماڵەوە دەربهێنم. منداڵەکانم لە جیهانی دەرەوە دەترسان، ئەوان وا فێرکرابوون کەوا جیهانی دەرەوە تەژییە لە کەسانی بەدکار، ئەوانەی لە دەرەوەی ئەو کۆمەڵەی ئەوانەوە دەژین بەدکارن، ئێمە لە کۆتاییی جیهانەوە نزیکین، ئەوەش بەشێکی سەرەکی بوو لە تێگەیشتن و کولتوورەکەمان، ئێمە وا فێرکرابووین کە خوا دنیا خراپ دەکات و کۆتایی دێت، هەموو بەدکارەکانی دەرەوە لەناو دەچن، تەنیا ئەوان سەلامەت دەردەچن، ئەوانی تر بە کۆمەڵ لەناو دەچن.

کە منداڵبووم لە بیرمە ئێمە کە بەجلی تایبەتییەکانم دەچووینە دەرەوە،

خـەڵکەکـە بە چ چاوێکی کـەم و نـاشـیـرینەوە سـەیریان دەکـردین، جلە تەقلیدییەکەمان چەند رەزاگران بوو، خەڵکەکە ناویان لە ئێمە نابوو پۆلیس، ئەوەش ئـامـاژەبوون بەو کـەسـانەی فـرەژن دەهێنن، ئەوانەی بڕوایان بە فرەژنییەوە هەیە، بەردبارانیان دەکردین بەچاوی سووک سـەیریان دەکردین، ئەوانەم باش لە بیرە کە خەڵکەکەی دەرەوە بەو چاوە سەیریان کردووین، کە بەردبارانیان دەکردین، ئەوەمان لا دروست بووبوو کەوا جیهانی دەرەوە چەند بەدکار و نیاز ئاوەگرن، باش ئەوەمان دەزانی ئەوان مـەبەستیان بوو ئێمە قڕ بکەن. نیـوەی شـەوبوو کـە لە مـاڵی لینداى خـوشکم دەرچووم، کـە گەڕامـەوە مـاڵەوە رەوشەکە ئارام بوو، دوو کیسی رەشی زەبڵم لە مەتبەخـەکە دەرهێنا، بە دزی چوومە ژووری منداڵەکان، مەبەستم بوو بڕێک جلوبەرگەکانیان ببەم، من بەردەوام ئەو ئیشەم کردووە و بەو جۆرە جلم بۆ شووشتن و ئوتوو بردووە، بۆیـەش ئەگـەر ئەوانی تر ببـینن من جلەکـان دەبەم کـەس گـومـانی لە هـیچ نەدەکرد، چونکە وایان دەزانی من بۆ شووشتن ئەو جلانە کۆ دەکەمەوە.

## گیانبازی

ژووری نووستنەکەی من لە ژێرزەمینەکە بوو، من گەڕامەوە ژوورەکەم، لەوێ دەستەجلێکم کۆکردەوە، ئۆتۆمۆبێلەکەم گەیاندە نزیک دەرگەی ژێرزەمینەکە، ئەوەم بەئـاسـانی بۆ کـرا، لەگـەڵ جلوبەرگ و هـەندێ لە کـەلوپەلەکـان وێنە و راپۆرتە پزیشکییەکانی دەرمان تایبەتییەکانی هاریسۆنم هێنا.

ئەو دەمانە هاریسۆنی کوڕم تەمەنی چوار ساڵ بوو، ئەو نەیدەتوانی بڕوات، بەردەوام پـەڕۆی تایبـەتیـمـان پێـوە هـەڵدەگـرت، ئەو نەخـۆش بـوو بەردەوام دەرمانی هەبوو، مـەبەستم بوو بگاتە دوکتۆرێک یان تیمێکی پسپۆری تایبەت، بۆیە وەک چارەسەرییەکی کـاتی دەرمانم لێ نەدەبڕی، ئەوەی سەیربوو رەوشی هاریسۆن بوو کە یارمەتی هەڵاتنەکەی منی دەدا، چونکە باوکی وای دەزانی من هەرگیز ناتوانم هاریسۆنی نەخۆش بفڕێنم، چونکە بەردەوام تەندروستی ئەو شپرزەبوو، ئۆکسجینی دەویست، ئەو بە ئۆکسجین هەناسەی دەکێشا،

پێش نووستن شەوانە بەو حاڵەتە هەناسەی دەدا، من دەمزانی ئەگەر ئەو مەکینەی لێ نزیک نەبێت دەمرێت، بەردەوام ترسم لەوە هەبوو، بەڵام من دەبووایە ئەو موجازەفەیە هەر بکەم.

لە سەعات چواری بەیانی منداڵەکانم هەموو لە شیرینە خەودا بەئاگا هێنا، منداڵەکانم تێ گەیاند کەوا سەردانی ئارسەری برامان دەکەین، لەوێ وێنەیەکی بەکۆمەڵدەگرین، لەوێشەوە بازاڕی دەکەین، من ترسی ئەوەم هەبوو من نەتوانم منداڵەکان بەو سەفەرە رازی بکەم، بەڵام سووربووم لەسەرئەوەی هەموویان لەگەڵخۆمدا ببەم. یەکێک لە ژنەکانی مێردەکەم لێمان بەژووری کەوت، کە هەوێیەکەم بینی وا (بیتی) کیژم خۆی دەگۆڕیت گومانی لەلا پەیدابوو، هەستی بە چرپەیەک کرد، بۆیەش چەند پرسیارێکی لە بیتی کرد. سەعات چوار و بیست دەقەی بەیانی بوو، لەو دەمانە ئەو تەلەفۆنی بۆ مێردەکەمان دەکات، لە تەلەفۆنەکە وتبووی، ژنەکەت لەگەڵ منداڵەکانی بەئاگان و خۆیان کۆدەکەنەوە و نیازی سەفەریان هەیە، پاشان باوکم بۆی گێڕامەوە کەوا میریلی مێردم تەلەفۆنی بۆ کردم، واتە پێنج دەقە پاش تەلەفۆنی ژنەکە، ئەو لەوێیەوە تەلەفۆن بۆ باوکم دەکات و لە باوکم دەپرسێت:

لەو دەمانە کارۆلین خەریکی چییە، چ لەبن سەردایە؟ ئەو دەیەوێ لەگەڵ منداڵەکان لە ماڵەوە دەربچێت. باوکم وەڵامی مێردەکەم دەداتەوە کەوا ئەو ئاگەداری هیچ نییە، باوکم بەڕاستی وەڵام داوەتەوە، چونکە ئەو ئاگەداری ئەو کارەی من نەبوو، ئەو نەیدەزانی من مەبەستمە لەگەڵ منداڵەکانم رابکەم، لەو کۆمەڵەیە دەربچم، ئەو ئەوەی نەدەزانی، چونکە من لەو ماوەیەدا زۆر ئاسایی دەجولامەوە و هیچم پێوە دیار نەبوو، لەگەڵ مێردەکەم پێوەندییم زۆر باش بوو، بەوەش ئەوم دڵنیا کردبووە کەوا نێوانمان ئاساییە.

دووبارە میریلی مێردم پێوەندیی بە ماڵەوە دەکات بەو هیوایەی من بدۆزێتەوە، بەڵام کۆششەکەی بێ ئومێدبوو، چونکە هەرچەند بە بڵندگۆکەی ماڵەوە منیان بانگ دەکرد، من وەڵامم نەبوو، من ئەوەم باش دەزانی ئەگەر وەڵامی ئەو بدەمەوە ناتوانم بەرنامەکە جێبەجێ بکەم و لە ماڵەوە رابکەم،

سەعات گەیشتبووە چوار و نیوی بەیانی، تەنیا چەند دەقەیەکم لەدەست مابوو شتێک بکەم و پلانەکەم جێبەجێ بکەم، یەک یەک منداڵەکانم سواری ڤانەکە کرد، سەرێکم بەناو ئۆتۆمۆبێلەکە گێڕا زانیم کەوا هەموویان لە ناو ئۆتۆمۆبێلەکەن، کەسیان کەم نییە، تەنیا هاریسۆن مابوو، گەڕامەوە ماڵەوە و ئامێرەکەی ئۆکسجینەکەم کوژاندەوە و دەستم دایە ئامێرەکەش بەرەو ئۆتۆمۆبێلەکەم برد، لەو دەمانە بیتی دیارنەبوو، چ بکەم یەکێکیان ماوە، ئەویان بکەمە قوربانی ئەوانی تر دوودڵبووم، چ بکەم؟ بەڵام بڕیارەکەم وابوو یان هەموویان دەبەم، یان ناڕۆم، دەبێ هەموومان بەیەکەوەبین، کە گەڕامەوە بینیم بیتی لە ژوورەکەی خۆی بە کوڵ دەگریێت، ئەو وتی:

تۆ ئەو کارە بە شێوەیەکی هەڵە دەکەیت، بۆچی ئاگەداری باوکم ناکەیتەوە، دەبێ باوکم تێ بگات تۆ چ دەکەیت.

## بواری سۆز نەمابوو

توند دەستی کیژەکەم گرت، بە توندی بەدوای خۆمدا رام کێشا و وتم:

من تۆ لە پاش خۆم جێ ناهێڵم، تۆش لەگەڵ ئێمە دێت. بەڵام ئەو دەگریا و هاواری دەکرد، بەڵام من پاڵمدا بەرەو ڤانەکە و کردمە ژوورەوە، مەکینەکەم گڕدا، دەترسام میریل تەلەفۆن بۆ پۆلیس بکات، بەو تەلەفۆنەش هەموو پلانەکەم هەڵدەوەشێتەوە، چونکە پیاوانی پۆلیسی ئەو شارەش ئەندامی FLDSبوون، بەردەوام پۆلیس لەو ناوچانە دەسووڕایەوە و بۆ FLDS کارکەربوون، ئەگەر ئەوان ئاگەدار کرابوونایەوە ئەوە بێگومان بەبێ ئەوەی مێردەکەم لەوێ بێت دەمانگرن و دەمانگێڕنەوە و سەفەرەکەم هەڵدەوەشێتەوە.

شەوەکە تاریک بوو، لە ئاوێنەکەوە سەیری پشتەوەی خۆمانمان دەکرد، دەمویست بزانم کەسمان لە پشتەوە نییە، هیچ ئۆتۆمۆبێلێک بەدوامان نەکەوتوون، خۆشبەختانە هیچمان لە دواوە نەبوو، خێراییەکەم زۆرتر کرد و پێم پێوەنا و بۆی دەرچووم. پاش رۆیشتنی دوو میل هەستم کرد بەنزینی ئۆتۆمۆبێلەکەم تەواو دەبێت، منداڵەکانیش تێگەیشتن شتێکی هەڵە روو

دەدات، شتێک دەقەومێت، لەودەمانەدا هەستم بەترس دەکرد، لە دوورەوە کۆگای (کەنگمان کورنرز)م لێوە دیارکەوت، بەڵام ڤانەکەم بەیەکجاری پەکی کەوت، بەنزینەکەم تەواوبوو، بە منداڵەکانم وت، تەواو ئۆتۆمۆبێلەکە نارِوات بەنزینم تەواو، بەڵام هەستم کرد خەڵک بەدەرەوەیە رەنگە ئەوان یارمەتیم بدەن، لە ڤانەکەوە هاتمە دەرەوە، بەرەو ئاراستەکەی (ئارسەر)ی برام رۆیشتم، ئەو لەگەڵ ئویل چاوەڕوانی دەکردین.

## هستیریا

ئەگەرچی کاتی سۆز و خۆشی دەربڕین نەبوو، بەڵام کە ئەوانم بینی هێرشم کردە سەر هەردووکیان و لە باوەشم کردن، بەپەلە بە براکەم وت، جارێ کاتی هیچ نییە، منداڵەکان هیچ نازانن، ئاگەداری هیچ نین، ناکرێ پێیان بڵێین چ روو دەدات، ئەوان بۆ چ هاتوون، بەڵام دوایی راستییەکان دەردەکەوتن و مەسەلەکە خۆی ئاشکرا دەبوو، نەدەکرا ئەوە بشاردرێتەوە. کە گەڕاینەوە ناو ڤانەکە، بە منداڵەکانم وت، ئەو پیاوانە دەیانەوێت یارمەتیمان بدەن، کەمێک بەنزینمان بۆ دابین دەکەن، کوڕەکەم سەیرێکی براکەمی کرد و وتی:

ئایا ئەوەیان خاڵە ئارسەرە؟

من یەک وشەم لە دەم نەهاتەدەر، نەمدەویست درۆی لەگەڵدا بکەم، دیارە کەوا هەموویان زۆر تووڕە دەبوون ئەگەر ئەو دەمانە راستی مەسەلەکەیان زانیبووایە. گەشتەکەمان لە ماوەی بیست دەقەی یەکەم ئاسایی بەڕێوە دەچوو، بەڵام نەمدەزانی کە گەیشتینە سولت لیک لەکوێ خۆمان بشارینەوە.

من لەوە دڵنیابووم کەوا میریلی مێردم شوێنپێمان دەکەوێت، نەدەکرا بچینە ناو ماڵی براکەم، یان ماڵی ناسیارێک، چونکە ئەوان ئەو شوێنانەیان زوو دەپشکنی، دەبووایە من شوێنێک بدۆزمەوە میریل هەست بەو شوێنە نەکات، بیری بۆ ئەو شوێنە نەچێت، دەکرا لە دەرگەی کێ بدەین، روو لە کام ماڵ بکەین، کێ رەزای دەبێت ئێمە بگرێتەخۆ. دەرۆیشتین و لە ناکاو گەیشتینە دووڕیانێک بەرەو شاری سۆلت لیک بەڕێ کەوتین، دەبووایە لەو دووڕیانەی

ڕێگە دەوڵەتییەکە ئاراستەی سانت جۆرج بگرین، کە تێدا هاریسۆن چارەسەر دەکرێت، لەوێ بیتی دەستی بەگریان کرد و وتی:

تۆ ئێمە دەدزیت و باوکم دێتە شوێنمان و ئێمە دەباتەوە.

ئەو دەگریا و بەشێوەیەکی هستیریایی هاواری دەکرد، منیش وەڵامم دایەوە و وتم:

کیژەکەم ئارام بە، هیچ دایکێک منداڵی خۆی نادزێت. ئەو وەڵامی دامەوە و وتی:

ئێمە تەنیا موڵکی تۆ نین، ئێمە موڵکی پێغەمبەرین، تۆ هیچ مافت بەسەر ئێمەوە نییە. منیش وتم:

با منداڵەکان خۆیان لە دادگا ئەو بڕیارە بدەن، لەوێ دەردەکەوێت کێ حەقی داینگەیی منداڵی هەیە، لەوێ ئەوە دەکرێت. کوڕە حەوت ساڵییەکەمان (ئەندرۆ) ڕووی لە ئێمە کرد و وتی:

دایە کە سەردانی دوکتۆرمان کرد، ناچین وێنەی یادگاری ناگرین...؟

لە وەڵامدا بیتی وتی:

نەخێر ئێمە بۆ وێنەگرتن ناڕۆین، دایکمان ئێمە دەباتە دۆزەخ.

کە ئەندرۆ ئەو قسەیەی بیست ڕووی لە من کرد و وتی:

دایە بۆچی وامان لێ دەکەیت، بۆ دەمانبیتە دۆزەخ؟ ئارسەر لە ناخەوە دەکولا و هیچ قسەیەکی نەدەکرد، براکەم ئەوەی باش دەزانی ئەو کارەمان هەموویان خستبووە ڕەوشێکی ترسناک، ئەو بێدەنگییەکەی بەوە تەقاندنەوە کە هاواری کردە سەر بیتی و وتی:

دایکت ئێوە ناباتە دۆزەخ، بەڵکو پێغەمبەر ئێوە دەباتەوە دۆزەخ! چەند جارێک داوای لە کیژەکەم کرد ئارام ببێتەوە و چی تر نەگرێت، ئەو بە کیژەکەی وت:

تۆ بەو گریانە هیچت پێ ناکرێت، هیچ گۆڕان لەو دەمانەدا ناکرێ، بێدەنگ بە. بیتی یەک بەدەنگی خۆی هاواری کرد و وتی:

پێغەمبەر ئێمە دەباتە دۆزەخ!

پاش پێنج دەقە گەیشتینە شاری سۆڵت لیک و لەوێ خۆمان شاردەوە، پاش سی و پێنج ساڵی تەمەنم هەستم کرد بۆ یەکەم جارە من سەربەستم، من دایکی هەشت منداڵم و تەنیا بیست دۆلارم پێیە، پاش چەند سەعاتێک میریلی مێردم وەک نێچیرێک بۆ دۆزینەوەمان بەدواوەمان بوو.

## منالییە پێشوەختییەکە

من لە رۆژی یەکەمی مانگی ینایری ساڵی ١٩٦٨ لە دایک بووم، من دووەم کیژی ماڵەوەمان بووم، لەن او خێزانێکدا گەورەبووم کە کۆمەڵەکەمان فرەژنی تێدا باوبووە، کورەکانی مافی ئەوەیان هەبووە زۆرترین ژمارە ژن بهێنن، لە ماڵی خێزانەکەی دایکم لە شاری هیلدیل لە ویلایەتی یوتا ئەو نەریتە زۆر باو بووە، سەردەم و بیرەورییەکانی منداڵیم لە شاری سۆلت لیکەوە دەست پێ دەکات، من تەمەنم پێنج ساڵان دەبوو، کە بەماڵەوە هاتووینەتە ئەو شارە، باوکم تەنیا یەک ژنی هەبووە ئەویش دایکم بوو، وەنەبێ ئەوان لەو خێزانەدا بروایان بە فرەژنی نەبووبێت. خێزانەکەمان پرۆژەیەکی عەقاری گچکەیان هەبوو، هەموومان بەو پرۆژەیە دەژیاین، خانووەکەمان لە سۆلت لیک لەناو باخچەیەکی بەدار و سەوزایی جوان بوو، بەڵام کە دەگوازینەوە کۆلۆرداو هەموومان لە ناو شوقەیەکی گچکەدا جێگەمان بۆ کرایەوە.

کە بەماڵەوە دەگوازینەوە شاری سۆلت لیک (نوریلۆن)ی دایکم بەو هەوارە نوێیە زۆر دڵشادبوو، دایکم ئەو شارەی زۆر پێ خۆش بوو، باوکم هەموو ئێوارەیەک دەهاتەوە ناومان، هەر کە کاری رۆژانەی تەواو دەبوو دەهاتەوە، بەڵام لە شاری کۆلۆرداو وا نەبوو. کارەکەی باوکم باش بوو، تا دایکم هەموو شتێک بۆ ماڵەوە بکرێت، ئەو پارەیەکی باشی لەبن دەستدا بوو، زۆریش کەمەی منداڵانەی بۆ ئێمە دەکری. پاش سێ خوشک کورێکمان دەبێت، بەوەیان دایکم زۆر دڵشاد دەبێت، چونکە کوری نێرینە لە کولتووری ئێمەدا زۆر شانازترە، من (ئارسەر بلاکمۆر)ی باوکم زۆر خۆش دەویست، ئەویش

منی لە خوشکەکانم زۆرتر خۆش دەویست. باوکم پیاوێکی باڵابەرزی لاوازی قژ رەشی تاریک بوو، من وام دەزانی کەوا من خاوەن جوانترین باوکم لە هەموو جیهاندا. یەک ساڵ لە شاری سۆلت لیک ژیانمان بەسەربرد، بەڵام ئەو ساڵە ساڵێکی زۆر خۆش بوو، هەموومان لەو ساڵە و لەو شارەدا کامەران بووین، بەڵام باوکم بڕیار دەدات بگوازینەوە شاری کۆلۆرادو سیتی لە ویلایەتی ئریزونا کە ٣٥٠ میل لە باشووری شاری سۆلت لیکەوە دوورە، لەوێیەوە بەردت هاویشتبوایە دەگەیشتە هیلدیل، ئەو شوێنەی کە من تێدا لە دایکبووم، ئەوەندە نزیک بوو.

لەبەرئەوەی باوکم نەیدەویست لیندای خوشکم لە قوتابخانەیەکی حکوومی بخوێنێت، بۆیە ماڵەکەمان لەوێیەوە بار دەکات، ئەگەرچی لە شاری کۆلۆرادوش دەچێتە قوتابخانەیەکی حکوومەتییەوە، بەڵام لەوێ مامۆستاکان زۆربەیان سەر بە کۆمەڵەی FLDS بوون، هەموویان کەسانی کۆنسێرتیڤی توندڕەو بوون، لە قوتابخانە حکوومییەکانی شاری سۆلت لیک وانەی ئاین نەبوو، بەڵام لە شاری کۆلۆرادودا وانەی ئاین هەبوو. کە گەڕاینەوە شارەکە باوکم خانووەکەمان بۆ گەورەتر دەکات، بەڵام لەو خانووەدا ژیانمان کامەران نەبوو، دایکم دڵشاد نەبوو، ئەو بەردەوام دەنووست، لەبەرئەوەی کەم باوکمان لە ماڵەوە دەبوو، بۆیە ماڵەکەمان ناخۆشبوو، ئەو زۆرتر لە دەرەوە بوو.

## دایکێکی نموونەیی

ئەو دەمانە کە دایکم زۆر بێزاربوو بەردەوام باسی مردنی دەکرد، دڵی خۆش نەبوو، چەند جار نیازی خۆکوشتنی هەبوو، ئێمەش هەستمان دەکرد ژیانمان کەوتووەتە مەترسییەوە، کە دەمانزانی دایکمان لە ژیان بێزارە و حەز دەکات بمرێت و دەیەوێت خۆی بکوژێت، ئێمەش بیرمان لەوە دەکردەوە، ئەگەر دایکمان بمرێت، ئێمە چ بکەین! باوکمان بەردەوام لە دەرەوەدیە، بەتەنیا چۆن دەژین، بۆیە من بەیانیکیان لە دایکمم پرسی: ئەگەر منداڵدایکیان بمرێت، منداڵەکان چییان لێ دێت؟ کێ بەخێویان دەکات؟

من هەست دەکەم دایکم زۆر باش لە نیەتی من و دڵگەرمی پرسیارەکەم تێ نەگەیشتووە، بۆیەش قسەکانی من هیچ کاریگەرییەکی لەسەر نەکردبوو، بۆیە لە وەڵامدا ئەو بە منی وت:

منداڵەکان هیچیان بەسەر نایەت، منداڵەکان گەورە دەبن، ئەوە باوکیان ژنێکی تر دەهێنێت، ئەو ژنەش منداڵەکان بەخێو دەکات. من ئەو دەمانە تەمەنم تەنیا شەشساڵێک دەبوو. کە وەڵامەکەم بیست، بە دایکم وت:

کەواتە وا باشە باوکم هەرچەندی زووە با ژنێکی تر بهێنێت. لەو رۆژانەدا هەستم دەکرد شتی نوێ لە چواردەورەماندا روو دەدات. دەمبینی ژنان کە دەچوونە بازار چاویلکەی رەشیان لە چاو دەکرد. دایکم وەک باوکم زۆر جوان بوو، جوانییەکەی ئەو بێ سنووربوو، ئەویش وەک باوکم بەژنێکی زراڤی هەبوو، ئەو بەردەوام جلی جوانی لەبەردابوو، قوماشی گرانی دەکڕی، بۆ ئێمەش جلی باش و گرانی دەکڕی، هەموو جیرانەکانمان، کۆمەڵگەکەمان بەچاوێکی تر سەیری دایکمیان دەکرد وەک ژنێک لە زۆر لایەنەوە رێزپەڕ نیگایان لەو دەکرد، بەڵام ئەوەش تەنیا رووکەش بوو، لە راستییدا دایکم ژنێکی رووخاو و بێ ئومێد دەژیا، مەزاجی تەواو نەبوو، رۆژانەی دڵڕەقانە لە ئێمەی دەدا، تا خۆی تووڕە بکات بیانووی لەسەر ئێمە دەدۆزییەوە.

من لە دایکم دەترسام، بۆیەش زۆر لە هەڵسوکەوتی ئەو شارەزا و پسپۆربووم، من ئەوەم باش دەخوێندەوە، ئەو تەنیا رۆژانە یەک جار لە ئێمەی دەدا، لێدانەکەی نەدەکردە دوو جار، کە تووڕە دەبوو و زەوقی نەدەبوو لە ئێمەی دەدا، بەتایبەتی ئێواران زۆرتر توند و رەقکار دەبوو.

کە لە منی دەدا، دەیوت من بۆیە ئازارتان دەدەم، چونکە ئێوەم خۆش دەوێت، بۆیەش من حەزم دەکرد ئێمەی خۆش نەوێت تا لێمان نەدات و دارکاریمان نەکات، من لەو دەترسام، پاش هەموو لێدانێکیش منی لە باوەش دەکردەوە، بەڵام ئەوەشیان ئازار و ئێشەکانی کەم نەکردەوە، ژانەکان قورس بوون و شوێنیان دیاربوون.

## هەندێک وایان دەزانی ژنان بە ماچکردن ئاوس دەبن

باوکم نەیدەزانی دایکم ڕۆژانە دارکاریمان دەکات، چونکە ئێمە ئەوەمان بە باوکمان نەوتبوو، لێدانی منداڵیش لە کولتووری کۆمەڵەکەمان دیاردەیەکی ئاسایی بوو، بەشێک بوو لە کارە پیرۆزەکانی پەروەردە و باوی ناو تایفەکەمان، لێدان یەکێک بوو لە باشترین کەرەستەی پەروەردە، هەرگیز ئەوە بە ئیهانە قبووڵ نەبوو، بگرە شێوەیەک بوو لە شێوەکانی تەئدیبکردن.

کۆمەڵگەکەمان تا رادەیەکی وا لەگەڵ دەرەوە داخراو بوو، ئێمە یەک کەسمان لە جیهانی تر ، من ئەو بیرەوەرییانەی سەردەمی ژیانمان لە شارە جوانەکەی (سۆلت لیک) هەر لە بیر مابوو، کە ئێمە لە ماڵەوە ئامێری تەلەڤزیۆنمان هەبوو، ئێمە بۆمان هەبوو سەیری بەرنامەکان بکەین، باوکم لە مەتبەخەکەماندا قاوەلێنەرێکی دانابوو، بە ئارەزووی خۆی قاوەی گەرمی فڕ دەکرد، ئەگەرچی لە کولتووری کۆمەڵەی (FDLS) قاوە خواردنەوە و بەکارهێنانی ئەو ئامێرە قەدەغە بوو.

هەرچەند رەوشی دەروونی دایکم ئاڵۆزتر دەبوو، ئەو زۆرتر لە ناو جێگەدا دەمایەوە، هەتا ڕۆژی پێش گەڕانەوەی باوکم کاروبارەکانی ماڵەوەی نەدەکرد، هەموو ئیشەکانی دوادەخست تا باوکم لە کار دەگەڕایەوە، بۆیەش دایکم و باوکم لەسەر پیسی و پۆخڵییەکانی بەردەوام شەڕیان بوو، باوکم لە خاوێنکردنەوەکەی دایکم بەهیچ شێوەیەک رازی نەبوو. ماڵەکەمان بووبووە مەیدانی شەڕێکی بەردەوام، هەستمان دەکرد ماڵەکەمان بەردەوام ئاڵۆز و پەشێوکاوە، بەڵام ئەوەی باش بوو لەو ماوەیەی باوکم کە لە ماڵەوە دەبوو، ئەگەرچی ماوەکەش کورت و کەم بوو، دایکم دەستی لەسەر درێژ نەدەکردین، لە ئێمەی نەدەدا تا ئەو دەڕۆیشتەوە سەر کارەکەی، لە بەدبەختی ئێمەش

باوکمان ماوەیەکی کەم لە ماڵەوە دەمایەوە، ئەو زۆرتر لە دەرەوە بوو. لەو دەمانەی دایکم بەختیار و کامەران بوو، کە دڵی بەژیان و بە ماڵەوە خۆش بوو حەزی لە یاریکردنی سپۆرت دەکرد، بەردەوام چیرۆکی جوان و خۆشی بۆ ئێمە دەخوێندەوە.

ئەگەرچی دایکم ژنێکی ئیمانداریش بوو، بەلام حەزی لە بەزم و گاڵتەش دەکرد، ئەگەرچی بە دەستووری کۆمەڵەی (FDLS) داری سەری ساڵ و داری لەدایکبوون قەدەغە بوو، رۆژیکیان دایکم دارێکی لەدایکبوونی بۆمان کڕیبوو، دارەکەمان رازاندەوە و ئاهەنگێکی سەرفرازمان ساز کرد، شیرنەمەنی و شکۆلاتەی زۆرمان خوارد، ئاهەنگەکەمان گێڕا، بۆیەش ئەوەمان کرد باوکمان لە ماڵ نەبوو، ئەگەر ئەو لە ماڵەوە بووایە ئێمە بۆمان نەبوو شیرنەمەنی بهێنینەوە ماڵەوە، تەنیا یەک جار حەقی ئەوەمان هەبوو شیرنەمەنی بێتە ماڵەوەمان، ئەو کارەش دەرچوون بوو لە رێنوێنییەکان و فەرمانەکانی باوکمان، من و لیندای خوشکم گەورەبووین دەمانزانی ئەو کارەی دایکم سەرپێچیکردنی فەرمانەکانی باوکمانە، رۆژێک دێ دایکمان باجی ئەو کارانە دەدات، بەلام هەستمان بەوە دەکرد یەکێک هەیە دڵمان خۆش دەکات، ئەوەی ئێمە پێمان خۆشە بۆمان ساز دەکات.

## یەکەم و دوایین جەژنی کریسمیس

بۆ بەیانی باوکمان هاتەوە، ئێمە چوونە ژوورەکانمان تا بخەوین، بەلام لەبەر هاتوهاوار و شەڕی گەرمی دایک و باوکمان خەومان نەبوو، ئێمە گوێمان لە دەمەقاڵێیەکانیان دەبوو، بەیانی کە لە خەو هەڵساین بینیمان داری کریسمیسەکەم لە ژوورەوە نەماوە، کە من و خوشکم لە ماڵەوە دەرچووین دارەکەمان بینی لەسەر شۆستەکە فڕێ دراوە.

دایکم جوانییەکەی دەدرەوشایەوە ئەگەر دڵی خۆش بووایە، بەتایبەتی کە لە شاری سۆلت لیک بووین، بەلام کە ماڵەکەمان گواستەوە شاری کۆلۆرادو ئەو دەکەوێتە ناو جیهانێکی داخراوی تەواو، بێجگە لە سک و زان و منداڵ

پەروەردەکردن هیچی تری نەبوو، لەگەڵ ئەوانەشدا ژیان و هاوسەریەتی لەگەڵ پیاوێکی دڵڤالا لە ئەڤین و خۆشەویستی ستەم و کارەسات بوو. ئەو بەردەوام قسەو گلەیی لەسەر دایکم هەبوو، شەو و رۆژ سەرکۆنەی دەکرد، بە پیسی و پۆخڵی تاوانباری دەکرد، گلەیی هەبوو لەوەی کەوا ئەو بایەخ بە جلوبەرگ و ئاکاری نادات، ئەگەرچی دایکم بەژنێکی رێکی زراڤیشی هەبوو.

لەولاشەوە دایکم هەستی بە داڕمان دەکرد، خەمۆکی رووی تێ کردبوو، بەتایبەتی کە دوا یادی کریسمیسمان لە ماڵەوە کردەوە، لەو رۆژەوە بەردەوام لە سەر جێگەکە پاڵی دەدایەوە و ماڵەکەی پشتگوێ خستبوو، هیچ چاوی لە بەڕێکردنی ماڵ و منداڵەکانی نەبوو.

داپیرەمان (جینی) لەبن دەستی دایکم دەری دەهێنایین، ئەو زۆر یارمەتی ئێمەی دەدا، کاروبارەکانی بۆ ئاسان و مەیسەر دەکردین، ئەو تەمەنی زۆری پێوە دیاربوو، پیری و ماندبوونی پێوە بوو، ئەگەرچی تەمەنی تەنیا شێست ساڵ بوو، دیاربوو نەریت و رێنوێنییەکانی کۆمەڵەکە (FDLS) هەراسان و بێتاقەتی کردبوو، لەبەرئەوەی ژنان لەو کۆمەڵەیەدا منداڵیان زۆر بووە و سکوزاری زۆریان کردووە و منداڵیان زۆر پەروەردە کردووە، بۆیە دووچاری جۆرەها نەخۆشی دەبوون، پیری و کەنەفتەییان زوو پێوە دیاربوو. داپیرەم دایکی دایکم یەکێک لەو ژنانەبوو کە زۆر بڕوای بە دیاردەی فرەژنی هەبوو، ئەوەشی بەیەکێک لە سرووتە پیرۆزەکانی کۆمەڵەکەی دەزانی، داپیرەکەمان چیرۆکی زۆری لەسەر ئەو مەزهەبانە بۆ دەکردین، ئەو دەیوت مەزهەب و کڵێسەی (MORMON CHURCH ) تا ئەو دەمانەی فرەژنی قەدەغە دەکات کۆمەڵەیەکی پیرۆز و سەرڕاست بوون، بەڵام کە دیاردەی فرەژنیان نەهێشت کڵێسەکەش پووکایەوە، لەگەڵ لێبووردنەوە دەیوت باپیرەم (بنیامین جۆنسۆن) یەکێک بوو لە پیاوە یەکەمەکان لەوانەی (جۆزیف سمیس) پێغەمبەر حەقی ئاسمانی لە سەدەی شازدەم بەو بەخشیبوو، ئەو دەیوت قسە هەبوو گوایە ئەو باپیرەم سی و سێ هەتا چل و سێ ژنی هەبووە، گچکەترین لەو ژنانە تەمەنی تەنیا چواردە ساڵ دەبوو.

## زەواجی ئاسمانی

نەریت و بڕوابوونی هاوسەرگیریی ئاسمانیینە کە کۆمەڵەی (FDLS) دەکاتە کۆمەڵەیەکی ڕێزپەڕ، بەپێی نەریت و سرووتەکانی ئەو کۆمەڵەیە ئەوەیە تا ببێتە کەسێکی ئاسمانی دەبێ ژمارەیەکی زۆر ژن بهێنێت، پیرۆزی پیاوەکە بەوە بەندە چەند زۆرتر ژنی لە یەک کاتدا و بەیەکەوە هەبێت، بەوەش ئاسمان لەو پیاوە رازی دەبێت، ئەو جۆرە پیاوانە لە ئاسمانیش ژنی روحییان دەبێت، ئەوانە منداڵی روحییان دەبێت، منداڵیش کە بووە کەسێکی روحی دەتوانێت هەنگاوی یەکەم بەرەو سەرزەمین بنێت. داپیرەم پێی وتم کەوا باپیرە گەورەکان حەوت ژنی هەبووە، کوڕەکانی ئەویش ژنیان زۆر هێنابوو، بە بۆچوون و بڕوای داپیرەم هاوسەرگیری ئاسمانییە هەموو بەرەکەتەکانی لە ناو بنەماڵەکەمان راگرتووە، من ئەودەمانە زۆر سەرفراز و بەختیاربووم بەوەی من نەوەی ئەو جیهانەم لە ئاسمانەوە دابەزیووم، من گوڵبژێر کراوم کە لە ئاسمانەوە روحم بگاتە سەر ئەو زەوییە.

من لە منداڵی بیرم لەوە دەکردەوە و بەوەش کامەران دەبووم، کە من لەو نەوەیەم کە روحمان بەهێزە و ئەو روحەیە ئێمەی بەو دەستە و کۆمەڵەیە شاد و بەختیار کردووە و بڕوامان بەو مەزهەبە هێناوە، من وام دەزانی من منداڵێکم لە هەموو منداڵەکانی تری جیهان بەختیار و کامەرانترم. داپیرەم ئەوەی لە مێشکمدا چەسپاندبوو کەوا ئەگەر من بکەومە ئەو جیهانە فرەژنییە، بەختم یار بێت و سەربەهەوێ شوو بکەم و مێردەکەم ژنی زۆری تری هەبووبێت، ئەوە شکۆدارم و ئازایەتی خۆم دەنوێنم. ئێمە بۆ ئەوە شرۆڤەی تایبەتییمان بۆ چیرۆکی سەندریلا هەبوو، بەو شێوەیە داپیرەم باسی ئەوەی بۆ دەکردین ئەگەر پیاوەکەمان ژنی زۆری هێنابێت، ئەوە بەرەکەتی ژنانەیە بۆ زۆربوون و گەشەی رەگەزی مێینە.

داپیرەم دەیوت ئێمە بەو بەرنامەیە و بە پرەنسیپەکانی هاوسەرگیریی ئاسمان پابەندبووین، تا کەنیسەی مورمونییە لە ساڵی ١٨٩٠ بەیانێکی دژ

بەو دیاردە فـرەژنەیەی دەرکـردووە، بۆیەش ئێمە بۆ مـەکسیک هـەڵاتووین، لە ترسی ئەو کڵێسەیە رامـان کردووە، ئێمـە و ئەوانەی لەگەڵ پرەنسیپی فرەژنی دابوون رامـــان کـــردووە و خـــۆمـــان دەرباز کـــردووە، لەســـەر بـەرنامـــە و بۆچوونـەکانی خـۆمـان سـوور بووینە و بڕوامـان بەو دیاردەیە نەگـۆڕیوە، ئەو تەمـــەنی دە ســاڵان بووە کـــە دووبارە گـەڕاونـەتەوە ئەمـەریکا، لەودەمـانەوە کڵێسـەی (مـورومنیـەت) بڕوایان وابـوو ئەوەی لەگەڵ فرەژنی بێت لـە تاعەتی خوا دەرچووە. بەڵام ئەوانـەی لەگەڵ سیاسـەت و بڕوای فـرەژنی بوون مانەوە و بەیەکەوە بۆ خۆیان بزاڤێکی ئوسـوڵیان دامـەزراندووە و لە سـەرەتای سـەدەی بیستەمـەوە ئەکتیڤانە کار دەکەن، لە ماوەی خەبـات و کارکردنی دە سـاڵەیان بوونـەتە کـۆمـــەڵەیەکی بەهـێــز و خـــەڵکێکی زۆریشـــیـــان بوونـەتە ئەندام و سـەرکردەی خۆیان پیرۆز دەکەن.

## کلیلەکانی رەهبانیەت

بە ژمارە (جۆن تایلور) سێیەم سەرکردەی کۆمەڵەکەمان بووە و یەکەمین کەس بووە داپیرەم باوەڕی پێـی هێناوە، یەکەم سەرکـردەی کڵێسەی مۆرمونییـەکان (بریگنـهـام یونـگ) بووە، لە پاش ئەو (جـــۆزیف ســیـــمـس) ئەو پۆســـتـــەی بەرکـەوتووە، باوەڕدارەکـانی تایلور ئـەوەی دەرنەدەکەوت، کلیلی رەهبـانیـەتی بەخشیوە و مـەسیحیش داوای لەو کردووە کەوا دیاردەی فرەژنییەکە بپارێزن، بە هـەموو شێوەیەک کۆشش بکەن ئەو دیاردە پیرۆزە نەفەوتێت.

کڵێسـەی مۆرمونی بەنیازبوو فرەژنی قەدەغە بکات، سـەرەتا سنووری بۆ ئەو دیاردەیە داناوە، پیاو بۆی نەبوو زۆرتر لە دوو ژن بهێنێت، ئـەوەی سـەرپێچیش بکات ئەوە ئەو لـەو کـــڵـێــســـە مـــەحـــرووم دەبێت، بەڵام لە ســاڵـی ١٩٢٠ ئەو دیاردەیان بەیەکجاری قەدەغە کردووە، ئەوەی لە یەک ژنی زۆرتری هەبووایە لە کڵێسە دەریان کردووە.

داپیـرەم منی وا ئیـقناع کردبوو کـەوا من کـەسێکی مـوبارەکم، چونکە لەو

کۆمەڵەیەم، بۆیەش کاری سەرەکی من تەنیا ئەوەیە زۆرترین منالم ببێت، بەوەش من وام دەزانی من ژنێکی تایبەتیم. من هەرگیز پرسی ئەوەم نەدەکرد بۆچی دایک و باوکم بەردەوام شەڕیانە، بۆچی بەردەوام دایکم دارکاریمان دەکات، چونکە ئەو جۆرە کارانە لەناو بروا و ئیمانەکەی ئێمە ئاسایی بووە و رەگی قووڵی داکووتابوو. لە داپیرمەوە ئەوەم زانی کەوا لە مانگی یولیۆی ساڵی ١٩٥٣ هێزێکی زۆری پاسەوانی نیشتمانی و پۆلیس چۆن بە شێوەیەکی دڕندانە هێرشیان کردبووە سەر باوەڕدارانی ئەو کۆمەڵەیە لە شاری (شۆرت کریل)، ئەو شارەی ئێستا ناوەکەی گۆڕاوە بە (کۆلۆرادو)، ئەو هێزە لە ویلایەتی (ئریزونا)وە هاتبوون ئەوانەی زۆرتر لە یەک ژنی هەبووایە دەیانگرت، یان ئەو ژن و پیاوانەی بڕوایان بەو کۆمەڵەیە هەبووایە. (مامە روی) خەڵکەکە هان دەدات بەرگری بکەن و خۆیان رابگرن، بۆیەش داپیرە و باپیرەم لەسەر هۆکاری ئەو هێرشە سەردانی دەسەڵاتداران دەکەن، لەو هەڵمەتەدا ١٢٢ کەس لە ناو ژن و پیاوەکاندا دەگیرێن، هەر لەو هەڵمەتەشدا ٢٣٦ منداڵیش لەو دایکانە وەردەگیرێنەوە کەوا فرەژنییان پەیڕەو کردووە، هێزەکە مەبەستی بوو ژن و پیاوەکان بگوازێتەوە شاری (کەنگمان) لە ویلایەتی ئریزونا کە چوار سەد میل لە شوێنەکەیانەوە دووربوو. بڕیاریش دەدەن منداڵەکان لە دایک و باوکیان جیا بکەنەوە و رادەستی ئەو خێزانانەیان بکەین کە بڕوایان بە فرەژنی نەبێت، بۆیەش منداڵەکان دەگوازنەوە شاری (فیونکس)، کە ژنەکان تێگەیشتن منداڵەکانیان دەدەنە ژنانی ترەوە بۆ ئەوەی بەناوی خۆیان بکەن و ئەوان بۆ خۆیان پەروەردەیان بکەن، ژنان یەکدەنگ رادەپەڕن و بەڕووی هێزەکان دادەچنەوە و دەسەڵاتداران ناچار دەکەن بڕیاری دوورخستنەوەی منداڵەکان رابگرن، بۆیەش ژنەکان بە منداڵەکانیان شاد دەبنەوە. داپیرەم برایەکی لە شاری فیونکس هەبووە، ئەو لەوێ جەخت لە دەسەڵاتداران دەکەن خوشکەکەی و هەر سێ منالەکەی ئازاد بکات، بەڵێن دەداتە حکوومەت کەوا ئەو منداڵەکان بەخێو بکات. مامە روی دەچێتە ڤیونکس تا ژن و منداڵەکان بدۆزێتەوە، لەوێ ژنەکان تەنگاو دەکات کە بە هیچ

شێوەیەک شاهیدی دژ بە مێردەکانیان نەدەن، لەوێشەوە کاردانەوەی یاسایی دژ بە هەڵمەتەکەی ئریزونا دەست پێ دەکات.

***

ئەو هێرشەی کرابووە سەر (شورت کریک) لێشاوێکی توندبوو، توانرا پشتیوانییەکی باش بۆ کۆمەڵەکە پەیدا بکەن، کاردانەوە یاساییەکە سەری گرت و فرەژنی گەڕایەوە ناو کۆمەڵەکە و خەڵکەکەش گەڕانەوە ناوماڵە یاساییەکانیان، دووبارە دیاردەی فرەژنی بەڕێوە دەچێتەوە، ئەوەش پشتیوانی و سۆزێکی گەرم بۆ کۆمەڵەکە پەیدا دەکات. بەڵام کۆمەڵەکە لە پاش ئەو گرتنە بەکۆمەڵە دەکەونە کارکردنی نهێنی، خەڵکەکەش ترس لە حکوومەت پەیدا دەکات، لە کار و چالاکییەکانیان دەکەونە کاری نهێنی، زۆر جاران جلی پۆشتەی پارێزگارییان دەپۆشی، خەڵکەکە تەنیا ملیان بەدەرەوەبوو، هیچ ئەندامی تری جەستەیان بەدەرەوە نەبوو، لەپێکردنی پانتۆڵیش لە ژنان قەدەغە دەکەن، مەسەلەکان گۆڕانی زۆری بەسەردا دێت، پاش هێرشەکەی شورت کریک، حەقیان دابووە کیژەکان لە دەستنیشانکردنی هاوسەرەکانیدا رایان هەبێت، کە جاران ژنان حەقیان نەبوو پیاوی هاوتەمەنی خۆیان هەڵبژێرن، ئەوەش زەبرێکی توندی لە پیاوە پیرەکان دابوو، چی تر بۆیان نەبوو کیژە تەمەن گچکەکان بهێنن، لەو گۆڕانەدا پیرەکان زەرەرمەندی گەورە بوون، ئەوان گرەوەکانیان دەدۆڕاند. لەو رەوشەدا ترسی ئەوەش پەیدابوو کوڕانی دەرەوەی کۆمەڵەکەیان عاشقی کیژەکانیان بن، لە پێش هێرشەکەی شورت کریکەوە ژنان نیازی ئەوەیان هەبوو، بیر لە مەسەلەی فرەژنی بکەنەوە، زۆر لە ژنەکان لە دەرەوەی کۆمەڵەکە خەڵکی خۆیان هەبوو، بەئاسانی دەیانتوانی روویان تێ بکەن و بەرەو ئەوان رابکەن، ئەوەش هیچ مەترسییەکی نەبوو، کە ئەو بژارەیان هاتبووە پێش پیاوەکان بەتایبەتی بەهێزەکان نیگەران بوون.

بەڵام هێرشەکەی شوری کریک ژنەکانی لە جیهانی دەرەوەش نائومێد کردبوو، وایان دەزانی خەڵکەکە هەموو دژی ئەوانن، کەسیان لەگەڵدا نییە، بەچاوی خۆیان بینییان چۆن منداڵەکانیان لە کۆشیان دەفڕاندن، بەڵام مامە

رووی بەڕووی ویلایەتی ئزیرونا دەوەستێت و لەو یاخیبوونە سەردەکەوێت، فاکتەری سەرەکی لەو سەرکەوتنەش پابەندبوونی ژنەکان بوو بە مێردەکانیان، کە ژنان رازی نەبوو لە سیستەمی کۆمەڵەکە یاخی بن، بەپێچەوانە ژنەکان زۆرتر پابەندبوونیان بە کولتوورەکەیان راگەیاند.

## ئازادی بەرامبەر ئاسایش

کە ژنەکان زۆر بە دڵسۆزییەوە پابەندبوونی خۆیان بە سرووتەکانی کۆمەڵەکەیان راگەیاندبوو، ئەوەش بوو ژنەکانی لەو هێرشە دەرباز کردبوو، بۆیە مامە رووی لە پاداشت ئەو تاعەتە زۆرتر کاری بۆ بەرژەوەندیی ژنەکان دەکرد، چونکە دڵنیابوو ژنەکان بڕوای تەواویان بە پیاوەکان و بە رەوشەکەیان هەیە، مەسەلەکە لە هەموو لایەنێکەوە گۆڕینەوەی ئازادییەکانیان بە ئاسایش بوو.

لەو رۆژەوە کیژەکان نوێژیان دەکرد مامە رووی پارێزراو بێت، ئەوان بەبڕیاری بەمێردانی ئەو رازی بوون، ئەو کام پیاوی بۆ ناو دەبردن ئەوان بەبێ بیرکردنەوە و رامان رازی دەبوون، بەوە بڕوایان کردبوو کەوا هەموو پرۆسەیەکی هاوسەرگیری لە ئاسمانەوە دابەزیوەتەوە سەرزەمین، کوڕ و کیژەکان بەبێ موبارەکردنی مامە رووی خۆشەویستییان پیرۆز نەدەکرا، ئەگەر هەردووکیان لە هەمان کۆمەڵەش باوەڕداریش بن، ئاشکرایە کەوا هەموو کۆت و رێنوێنییەکانی ناو کۆمەڵەکەمانەوە ساز کرابوو، هیچیان لە دەرەوە لەسەر نەکرابوو.

ئەگەرچی خەڵکەکە باش دەیزانی ئەوەی لە ناو ئەوان سەبارەت بە فرەژنی پەیڕەو دەکرێت بە یاسا قەدەغەیە و حکوومەت و دەسەڵاتی ویلایەتەکە پەسەندی ناکات، هەموو دەمێ ئەگەری ئەوە هەیە بگیرێن و لێپرسینەوەیان لێ بکرێت، بەڵام ئەوان زۆرتر گوێڕایەڵی سیستەمی تایفەکەیان دەبوون، چونکە هێرشەکەی (شوری کریک) ئەوانی زۆر ترساندبوو، هەموو ئەوەیان دەزانی

کەوا (مامە روی) ی بوو ئەوانی دەرباز کردبوو، بۆیەش گومانیان نەما کەوا مام روی پێغەمبەری خوایە.

کە داپیرەم ئەو چیرۆک و بەسەرهاتانەی بۆ دەگێڕامەوە، وام دەزانی نەخشەی ژیانی دوارۆژم بۆ دادەڕێژێت، چونکە لەلای ئەو روون و ئاشکرابوو کەوا ئەوە قەدەرمە.

من لە تەمەنی شەش ساڵییەوە یاری کۆتاییی کەونمان دەکرد، لەجیاتی ئەوەی یارییە ئاساییەکانی منداڵانی ئەو تەمەنە گچکەیە بکەین، یاری کەون و بوونمان دەکرد، ئەوەش بۆ ئێمە زۆر جێگەی ورووژاندن بوو. مەسەلەکە لە سیحر و جادووگەرییەوە نزیک بوو، ئەوەش کۆپی یارییە تایبەتییەکەی ئێمە بوو، یاری خۆشاردنەوە و گەڕان بەدوای دۆزینەوە. ئێمە لە سەرەتای تەمەنمان بووین زۆر شتمان لەسەر کۆتاییی جیهان و کەون دەزانی، لە رۆژانی یەکشەممەواندا دەرسی ئەوەیان پێ دەداین کەوا ئێمە میللەتی خوای موختارین، خواش لە رۆژی قیامەتدا ئێمە دەپارێزێت و هەموو بەدکارەکانی ئەو جیهانە لەناو دەچن، تەنیا بە فەرمانی خوا ئێمە لە پاش خاپووربوونی دنیا دەربازمان دەبێت، ئەوەش هەموو لەبن دەسەڵاتی خوایە. لەودەمانە من ئەوەندە گچکەبووم نەدەکرا پرسیاریش لەو مەسەلانە بکەم.

ئێمە لەو تایفەیەدا بەپێچەوانەی خەڵکەکە لە دنیا تێکچوون ترسمان نەبوو، باکمان بە کۆتایی دنیا نەبوو، چونکە لەوە دڵنیابووین کەوا تایفەکەمان دەربازی دەبێت، ئێمە ئەوەمان بەباش دەزانی، چونکە پاش ئەو فەنابوونە سەد ساڵ هەموو دنیا بە ئاشتی دەژیت، دیارە ئەوەش بۆ ئێمە زۆر باش بوو.

کە خوا بەدکارەکان لەسەر زەمین لەناو دەبات و لەسەر کارە بەدەکانیان سزایان دەدات، دیارە ئەوان دەستەوەستان نابن، بۆیە کۆشش دەکەن میللەتە موختارەکانی خوا لەسەر زەمین لەناوبەرن، ئێمە بڕوامان بەو بانگەشەیە هەبوو، ئەوەشمان دەزانی کەوا حکوومەت دەزگایەکی بەدکارە و نیازخراپە، هەموو دەمێک ئامادەیە هێرش بکات سەر کۆمەڵەکەمان و ژن و منداڵەکانمان بفرێنێت، پیاوەکانمان بکوژێت و قڕمان بکات، بەڵام تاکە رێکەی

خۆپاراستنمان دڵسۆزیمان بۆ خوا و نوێژکردنی بەردەوام و پاڕانەوەمان بوو لە کردگار، هەر ئەویشە نوێژ و سەلاوەتەکانمان قبووڵ دەکات و گوێمان لێ رادەگرێت. بە قسەکانی مامە روی و کەسانی تری وەک ئەو کە هیندییە سوورەکان لەدەست کۆمەڵکوژییەکەی نیشتەجێبووە نوێیە ئەوروپییەکان دەربازیان بووە، ئەوان میللەتی موختاری خوایان پاراستووە، بەلام دیارە کەوا بەدکارەکان بە دەستی حکومەت نیازیان وایە قڕمان بکەن، یان بەرنامەی تر ساز بکەن تا ئێمە لەناو بچین.

## میللەتی هەڵبژاردەی خوا

لەو یارییەی لە سەردەمی منداڵی بەناوی یاری کۆتاییی کەون دەمانکرد، پیاوە باشەکانی هیندە سوورەکان ئێمەیان لەدەست و زەبری حکوومەت دەپاراست، بەلام ئەوەندەمان بەس نەبوو، چونکە ئێمە لە خۆرهەلاتەوە هێرشمان کراوەتە سەر، لەوێیەوە رووسەکان دژمان بوون، لە خۆرئاواشمانەوە چینییەکان دژمان کار دەکەن، بەلام میللەتی موختاری خوا لەسەر داگیرکەران سەردەکەون و بازنە گەرمەکانی دوعا و نوێژەکانمان دەمانپارێزێت.

لەو گەمەیەدا ئێمە هەموومان لە حەشارگەکانمان دەردەچووین، لە شێوەی بازنەیی کۆ دەبووینەوە، وامان نیشان دەدا کەوا بۆیە وا بە کۆمەڵ دانیشتووین گوێ لە راپۆرتە هەواڵەکانی ئێستگەکان دەگرین کە باسی داگیرکەرە چینییەکانی دەکرد لە ناوچەی نیڤادا، قسەمان لەسەر ئەوە دەکرد کەوا رووسەکان وا دەگەنە سەر رووباری مسیسیبی، لەو کۆڕانەدا دەمانوت دەبێ ژن و منالەکان لە شارەکان دووربخرێنەوە، ئەوان مەترسییان لەسەرە و داگیرکەرەکان زەبریان کوشندەیە و نیازیان خراپە، هەر لەو گەمانەدا دەمانوت کەوا پیاوەکان لەو شەڕانەی بۆ بەرگری دەکرا هەموو دەکوژرێن.

لەبەرئەوەی ئێمە لە نەوەی میللەتێکی هەڵبژاردەی پیرۆزین، بۆیە داوامان لێ دەکرا لە شوێنە پیرۆزەکان چاوەڕوان بین، ئێوە چاوەڕوانی سوپاکانی ناو

شەڕەکە بکەن، ئەوانەی لەجیاتی ئێمە شەڕەکان دەکەن، ئەوان ئێمەیان وا تێ گەیاندبوو. شەڕەکان تەواوبوون و گەمەکانی ئێمە هەر تەواو نەبوون، لەبەرئەوەی بۆمان نەکرا بەشی خۆمان ئەرزی کشتوکاڵی داگیر بکەین، بۆیە بەروبوومان نەبوو، هیچمان نەچاند، برسیەتی هیلاکی کردین. لە ناو باخچەکانی ماڵەکانمان بە کۆمەڵ خۆمان دەشاردەوە، نامەی هەڕەشەیان بۆ دەناردین، خەڵکمان بەدەستی بەدکارەکان دەکوژران.

یەکێک لە بەشەکانی گەمەکەمان ئەوەبوو کەوا هێرشێکی دڕندەی هیندییە سپییەکانمان دەکرایە سەر، ئەوەی کەوتبووایە بن دەستیان دەیانکوشت، کەسیان نەدەپاراست، تەنیا ئەوانەیان نەدەکوشت کە (جلی موبارەکیان لەبن جلەکانیان لەبەردابوو)، سەربازە هێرشبەرەکان جلەکانیان هەڵدەدایەوە و دەستی ئازاریان بۆ ئەوان نەدەبرد، ئەوانە بواری سەد ساڵی ئاشتییانەیان هەبوو.

## هەندێک وایان دەزانی بە ماچ ئاوس دەبن

ئێمە ئەوەمان دەزانی و فێرکرابووین کەوا خوا دەسەڵاتی هەیە بەیەک سات و لە چاوقوچانێکدا هەموو گۆی زەوی بگۆڕێت، مامە روی دۆڵی هەزار بەهەزارەی ناوبراو بە (گراند کانیونی) وەک نموونەی دەسەڵاتی مەزنی خوا ناو دەبرد، ئێمە وامان دەزانی کەوا ئەو دوڵە جاران شارێکی ئاوەدان بووە، بەڵام خەڵکەکەی لەبەرئەوەی پیاوچاکێکیان رەفاندبوو، پاش چەند رۆژێک بە کوژراوی تەرمەکەیان دۆزیوەتەوە و زانراوە کەوا بەدەستی هاوولاتییانی ئەو شارە کوژراوە، لەو رۆژەوە خوا لە تۆڵەی ئەو پیاوە شارەکە کاول دەکات و دەبێتە دۆڵێکی هەزار بەهەزاری سەخت.

دەبووایە قوتابخانەکەی ئێمەش هەموو بەرنامە و پرۆگرامەکانی ئاسایی بووایە، چونکە قوتابخانەیەکی حکومی بوو، بەڵام بەرنامەکانی لەسەر بنەماکانی ئاینییەوە سەرچاوەی دەگرت، هەموو قوتابییەکانمان لە کۆمەڵەکەی

خۆمـان بوون، ئەو بەشـەی کـتـێـبـەکـان و پـرۆگـرامـەکـان لە نـەریتـەکـانی کۆمەڵەکەمان دوور بووایە دەیانقرتاند و ئێمە بۆمـان نەبوو بێجگە لەو بابەتەی تـایـفـــەکـــەمـــان رێگەی پێ دەدا هـیـــچـی تـر بـخـــوێـنـین. یەکـــێـک لـە دەستەخوشکەکانمان لە ماڵەوە خـوشـکێکی گەورەی هەبوو، ئەو فێری کردبوو سـێکس چـیـیـە و بۆی راڤـەکـردبوو، ئەودەمـانـە من لە پۆلی چوارەم بووم کـە یەکەمین جـار ئەو زانیارییەم بەرگوێ کەوتبوو، لەو کیژە فـێربووین چۆن منداڵ پەیدا دەبێت. کـیـژەکە بە خـوشـکی وتـبـوو من نـامـەوێ ئەو شـتـانە بزانم، بەڵام ویـسـتـبـووی بە چاوی خـۆی ئەو زانـیـارییـە بـبـینێت، نەک بـە قـسـەکـردن بیبیستێت. کە کیژەکە خوشکەکەی ناچار دەکات ئەوەی بە پراکتیک فێر بکات، ئەو دەستی لەسەر ئەندامی سێکسییەکەی خۆی دانابوو، بەدەستی گەمەی پێ کردبوو، ئەوەش دەرسەکەبوو کە کیژەکە لە خـوشکی فێربووبوو، کە مێردەکەی چ لە ئەندامەکەی ئەو دەکات، بۆیەش کیژەکە کە ئەوە دەزانێت رقی لە خوشکی و لە سێکسیش دەبێتەوە و توورە دەبێت.

لە قوتابـخانەکانی کۆمەڵەکەمان دەرسی کولتووری سێکسی نـەدەخوێندرا، ئێـمـە ئەوەمـان لە شـەوی بەزاوابوون دەبینی، ئەوەمـان بۆ یەکـەم جـار لەو شـەوەدا تـام دەکـرد و دەمـانزانی، زۆریش لە ژنـان وایان دەزانی منداڵیـە ماچکردن پەیدا دەبێت، تەنیا ماچە کە ژنان ئاوس دەکات.

لە قوتابخـانەکانی ئێمـە نەک لێدان لە منداڵان قەدەغە نەبوو، بگرە بەشێکی پرۆگرامەکان بوو، وەسیلەیەک بوو بۆ فێربوون، هەر لە منداڵییەوە ترسیان لە هەناوی منالان دەچاند، لە کڵێسەکانماندا هەر بەترسیش بوو کە خـوامـان خۆش دەویست، چونکە وامان دەزانی بەوەیە روحی منداڵەکان دەپارێزین، کە لە قـوتابخـانە دارکـاری دەکـراین ئەوە لە مـاڵەوە دەیانوت دیارە هەڵەیەکـتـان کـردووە، بۆیەش دەبووایە بچینەوە لای مـامۆسـتاکانمان و داوای لێبووردنیـان لێ بکەینەوە و ئەوەی لە قـوتابـخـانەکـان لە قـوتابییـەکـان دەکـرا، جـێگەی رەزامەندی دایک و باوکەکان بوو.

## جینز لەبەرکردن بۆ کیژەکانمان قەدەغە بوو

ئێمە لە ناو باخچەکەی ماڵەوە یاریمان دەکرد، لیندای خوشکم بەتەنگاوی هات و وتی باوکمان دەچێتە شاری سۆلت لیک تا ژنێکی نوێ بۆ خۆی بهێنێت، هەواڵەکەمان بە سەرسامییەوە وەرگرت، بەڵام دڵشادبووین، چونکە دەمانزانی باوکمان بەو ژنە دڵی خۆش و کامەران دەبێت.

ئێمە ژنە نوێیەکەی باوکمان دەناسی و زۆریشمان خۆش دەویست، ئەو ناوی (رۆزی) بوو، لەگەڵ دایکمان دۆستایەتی گەرمی هەبوو، لە یەکێک لە داینگەکانی شاری سۆلت لیک ئێمەی پەروەردە دەکرد، دڵمان بەوە خۆش بوو ژنەکە خزمی دایکمان بوو، دڵنیابووین ئەو رەوشت و رەفتاری لەگەڵ ئێمەدا باش دەبێت. بەردەوام پیاوەکانی تایفەکەمان لەو دەگەڕان ژنی نوێ بهێنن، ژمارەی ئەو پیاوانەی لە ناو کۆمەڵەکەمان نۆرەیان گرتبوو ژنی نوێ بهێنن بەردەوام لە نێوان دە هەتا بیست و پێنج کەس دەبوون، پیاوە بەهێز و بەدەسەڵاتدارەکانی کۆمەڵەکەمان زۆرتر شانسی فرەژنیان هەبوو، ئەوەی لە سێ ژن زۆرتری هەبووایە مانای ئەوە بوو ئەو پیاوە یەکێکە لە کەسە ناودارەکانی تایفەکەمان، دەکرا یەک پیاو دوو خوشکیش بهێنێت.

رۆزی ژنێکی جوانی بەرچاو بوو، ئەو بەوە دەناسرا کەوا جوان منداڵ بەخێو دەکات و کابانی ماڵەوەیەو دەستاوی خۆشە، ئەو بە ژنێکی کارکەری بەتوانا لە ناو کۆمەڵەکەمان دەناسرا، کەم ژن لە ناو تایفەکەی ئێمە هەبوو پێش شووکردنی خوێندنی باڵای تەواو کردبێت، بەڵام رۆزی توانیبووی بچێتە کۆلێجی پەرستیاری. من ئەودەمانە لە هەستی دایکم تێ نەدەگەیشتم لەسەر ژنهێنانەکەی باوکم بۆچوونی چییە و سۆزی ناخەوە چ دەردەبڕێت، ئەوەی من بزانم دایکمان هەر ئەوەندەی دەویست بتوانێت ئەو ژنەی دەبێتە هەوێی ئەو

بتـوانێت خـۆشی بووێت، من باشم دەزانی پاش ئەو ژنهـێنانە شـتـێک لە ماڵەکەماندا دەگۆڕێت، بەڵام تێ نەدەگەیشتم گۆڕانەکە بەرەو چ ئاراستەیەک دەبێت. ئێـمـە لە مـاڵەوە مـاینەوە دایکم و بـاوکم بەیەکـەوە بۆ ژنـهـێنانەکـە سەفەری شاری سۆلت لیکیان کرد، بەڵام کە گەڕانەوە ڕۆزی بووکیـان لەگەڵدا نەبوو، دیارە ژنەکـە لەبەر تاقـیکردنـەوەکـانی لە شـارەکـە دەمـینێـتـەوە بەو هیـوایەی دوایـی بگەڕێتـەوە، تا ئـەو خـوێندنەکـەی تەواو بـکات باوکم لەوێ خانوویکی بۆ کڕیبوو تا تێدا بۆ خوێندنەکەی و بۆ کارکردن نیشتەجێ بێت.

ڕۆژی زۆر بە کـەمی بۆ سـەردانمان دەهاتە شـارەکـەمـان، ئێـمـە ترسی ئەوەمـان هەبوو ئەو ژنـە باوکم لە دایکم بدزێت و بـۆ خـۆی زەفـتی بکات، کـە ژنەکە دەهاتە ماڵەوەمان باوکم بەو سەردانە دڵی خۆش دەبوو، ئەوان بەیەکەوە لە ژوورەکەی لیندای خوشکم دەمانەوە.

## پێوەندییەکی ئاڵۆز

پێـوەندیی دایکم و باوکم ڕۆژ بەڕۆژ تـوندتر و ئاڵۆزتر دەبوو، پاش ئـەوەی ژنی بەسـەرهات دایکم کـەمـێک ئارامـتـر بووبوو، باوکم تا دایکم دڵخـۆش و ڕازی بکات تەلەڤـزیۆنـێکی بـۆ هێنـابووە مـاڵەوە، ئەوەش سـەرپێـچی داوونەریتی کۆمەڵەکەمان بوو، بەڵام ئامیرەکە تەنیا دوو کەناڵی وەردەگرت، بەڵام بە هەموو حاڵەتێک شتێکی قەدەغە و نوێ بوو.

زڕدایکەکەمـان ئۆتـۆمـۆبێل و مـاڵ و خـانووی تایبـەتی لە شـاری سـۆلت لیک هەبوو، ئەو لەچاو دایکم زۆر سەربەسـتتر بوو، کارەکـانی خۆی بەڕێوە دەبرد و لە هەمـوو ئەو ژنانەی ئێمـە دەمناسـین ئەو سـەربەسـتتر بوو، بەئارەزووی خـۆی کـاری دەکـرد و دەسـووڕایەوە، بـەڵام ئەویش وەک ژنەکـانی تـر کـە ئاوس بوو، دیارە کـەوا ئازادییـەکـەی وەک جـاران نامـێنێت، دوو مـانگ پێش ئەوەی منداڵەکەی ببێت، ئەو هاتە سەر ماڵەکەی ئێمە لە شاری کۆلۆرداو.

بە هـاتنی ئەو ژنە ململانێ لە ناو ماڵەکەمـان دەستی پێ کرد، هـەردوو ژنەکە بەئاشـکرا ڕکـابەرایەتی توند و دژواری یەکـتـریـان دەکـرد، باوکم بە ئـاسـانی

هەستی بەو رەوشە نوێیە دەکرد، ئێمە لە نێوان کوڕەکەی ئەو ژنە و براکەی خۆمان کە یەک تەمەن بوون، بەراوردمان دەکرد، پاش ئەو کوڕە رۆزی کیژێکی بوو، ناومان نابوو رۆزی گچکە. ماوەیەکی پێچوو رۆزی لە شارەکەی خۆمان لە یەکێک لە داینگەکاندا کارێکی دەست دەکەوێت ئەوەش لەچاو ژنانی کۆمەڵەکەمان زۆر بوو، چونکە ژنەکانی تایفەکەمان ئەوەی کاری هەبوو و بوارساز بوایە کار بکات، لە کارگەی دورمانەکەی گەڕەکەکەمان کاری کردووە، کەم ژنی ئێمەش کاری وا شایستەیان هەبووە. ئەو ژنانە لەو کارگانەدا بە چاوی کۆیلە سەیریان کراوە و رۆژانەکانیان زۆر کەم بووە، سەرەڕای ئەوەی کارەکانیان زەحمەت و ماوەدرێژبوو، ئەوان زۆریان نزیکەی دە منداڵیشیان بەخێو کردووە، رۆژەکانیان زۆر کەم بووە، سەعاتی لە سێ دۆلار تێپەڕی نەکردووە، ئەوەی زۆر کارکەر نەبووایە، دەستی رەنگین و بەبەرهەم نەبووایە زوو دەریان کردووە. کە من ئەو ژنانەم لەو کارگانە دەبینی، بەڵێنم لەگەڵ خۆمدا دووپات دەکردەوە کەوا لەسەر خوێندنەکەم بەردەوام بم، کۆشش زۆر بکەم تا بگەمە پلەیەکی خوێندەواری باش، تا تووشی ئەو کارگانە نەبم، رۆزی ژنێکی ئیمانداربوو، ئەو بڕوای وا بوو کە یارمەتی باوکم دەدات خێری زۆری بۆ دەنووسرێت، ئەوەی بە ئەرکێکی ئاینی زانیبوو، ئەو بێجگە لەوە بڕواشی بە فرەژنی هەبوو، ئێمەش بڕوامان بەوە هەبوو، (من لە تەمەنی نۆ ساڵیدا بڕوام وابوو) هەر چەند پیاو ژنی نوێ و زۆرتریش بەسەر ژنە کۆنەکانی بهێنێت ئەوا خۆشەویستی بۆ ژنەکانی تری هەر زۆرتر دەبێت، دایکم لەو مەسەلەیەدا هەستی بەوە کردبوو، کەوا باوکمان پاش ئەوەی ژنی بەسەر دایکم هێنابوو، نێوانیان خۆشتربوو، دایکم دەیوت باوکتان پاش ئەوەی رۆزی هێناوە لەگەڵمن نەرمتر و باشتر بووە.

## بنەماکانی تێکئاڵان

ئێمە لەوە دڵنیا بووین کەوا باوکم رۆزی لە دایکم خۆشتر دەوێت، بەڵام گەرمبوونی پێوەندییەکانی دایکم و باوکم دڵی ئێمەشی خۆش کردبوو، وا

دەزانم لەبەر خۆشەویستی ڕۆزی بوو، کە باوکم دایکمی خۆش دەویست، من هیچ لێکدانەوە و شرۆڤەمان نەبوو، بەڵام هەستمان بەو مەسەلەیە دەکرد. ماڵەکەمان دوو دایکی تێدا بوو، هەردوو ژن بەردەوام منداڵیان دەبوو، لە ماوەی ساڵو ساڵ و نیودا منداڵێکی نوێیان دەبوو، دایکم هەردوو منداڵەکانی بەخێو دەکرد، بەوریایی چاوی لە منداڵەکانی ڕۆزییش دەبوو، چونکە ئەو دەوامی دەکرد و کاتی تەواویش لەسەر کاربوو، بۆیەش هەموومان من و خوشکەکانیشم ئاگامان لە وەچەی ڕۆزیش دەبوو. من و لیندای خوشکم تەمەنمان سێزدە و چواردە ساڵان بوو، جارێکیان مۆڵەتی ئەوەمان وەرگرت لە گەڕەکەکەمان بچینە ئاهەنگێکی سەماکردن، ئێمە لە گۆشەی ئەو کیژانە دانیشتین کە شوویان نەکردبوو، ئەوەش داوونەریتێکی خۆمان بوو، بەوەش یەکترمان باش ناس دەکرد، ئەگەر کوڕێک داوای سەمای لە کیژێک کردبووایە کیژەکە لە سەماکردنەکە یان ڕەفزکردن ئازاد بوو، بەڵام ئەو کیژانە بۆیان نەبوو لەوانەی تەمەنیان لە خۆیان گەورەترە سەماکردنیان لەگەڵدا ڕەفز بکەن، خۆ ئەگەر پیاوەکە زۆریش لە کیژەکە بەتەمەنتر بووایە، ئەوەش یەکێک بوو لە نەریتە بەدەکانی کۆمەڵەکەمان. ئەوەبوو بنەماکانی تێکئاڵان، ڕۆژێکیان لۆرای دەستەخوشکم ئەوەی بەسەرهاتبوو، چونکە ئەو داوای سەمای لەگەڵ پیاوێکی بەتەمەنی ڕەفز دەکاتەوە، کە ئەوەمان زانی هەمووومان دڵتەنگ بووین ئەو هەواڵەمان زۆر لا ناخۆش بوو، ئەو بەوە بەختیاربوو، چونکە قبووڵی نەکردبوو شوو بەو پیاوە بە تەمەنە بکات، کە نێوانی تەمەنیان زۆر زۆر بوو. کە مەسەلەکە حەلکرا و دۆخەکە ئاسایی دەبێتەوە، ئێمە دووبارە گەڕاینەوە ناو کۆڕی سەماکە، مۆزیک گەرم دەکرا، هەمووومان چاومان لەوەبوو کوڕێکی لە تەمەنی خۆمان داوای سەماکردنمان لێ بکات، لەگەڵ ئەواندا ڕووبەڕوو ببینەوە. هەموو چاوەکان چاودێری ئەوەیان دەکرد بزانن کێ لە کیژەکان دەکەوێتە ئەو داوە و پیاوێکی بەتەمەن داوای سەمای لێ دەکات. دەبووایە لەو ئاهەنگەدا ئێمە جلی سادە و بەحورمەت لەبەر بکەین، دەبووایە جلەکان تەسک نەبن، بە جەستەمانەوە نەنووسێن، گوشتمان بەدەرەوە نەبێت، سینگمان

نەكرابێتەوە، ڕەنگی جلەكانمان كراوە و بەڕەونەق نەبن، كوڕەكان ملپێچیان لەسەر قەمیسەكانیان بەستابوو، جلی فەرمییان لەبەر دەكرد و بۆیان نەبوو پانتۆڵی جینز لەبەر بكەن. لەو ئاهەنگەدا بوار ساز دەبوو، منداڵەكانی هەردوو دەستەی ناو كۆمەڵەكەمان بەشداربن، لەو ئاهەنگەدا ئێمە ئازادبووین سەما لەگەڵ كێ دەكەین، لەوێ هەستم دەكرد كوڕەكان سەیرم دەكەن، من لەوانی تر زۆرتر سەرەنجی كوڕەكانم رادەكێشا، زۆربوون ئەوانەی سەیری منیان دەكرد.

## تاكە چارەسەر

لەو ئاهەنگەدا هەستم دەكرد زۆرتر بوارمان ساز بوو هەست و دەربڕینەكانم دەرببڕین، تاكە بوار بوو كە ئێمە بتوانین بەرجەستەی سۆزەكانمان بكەین، ڕۆژێكیان ئێمە دەستە كیژێك بووین قسەمان دەكرد، یەكێكیان وتی، ئێمە زۆر بەدبەختین تەنیا بۆ ئەوە هەڵگیراوین تا شوو بە پیاوێكی بەتەمەن بكەین، كار و بەرنامەشمان لەو پرۆسەیەدا تەنیا ئەوەیە ئاگەداری ئەو پیاوە بین و ئارەزووەكانی بهێنینە دی. منیش لەوێ بە كیژەكانم وت، مەرج نییە، زۆر لە كیژەكانمان شوویان بە گەنجەكانمان كردووە، یەكێك لە كیژەكان وەڵامی دایەوە و وتی ئەوە تۆ باسی چ دەكەیت، ئەوەیان ناوازەیە، كەی ئەوە بووە ئەگەر كیژێك زۆر دڵی چووبێتە كوڕێك و بەیەكەوە بەڵێنیان دابێت، هەردوولا سووربن لەسەر هاوسەرگیری ئەگەرنا چارەنووسمان وەك یەكە و هەموو مێردەكانمان پیاوی بەتەمەن دەبن و ناچارین قبوولمان بێت، بۆیەش تا لە دەست پیاوە پیرەكان دەربازمان بێت و نەكەونە باوەشی ئەوان، دەبووایە بۆ خۆمان ئازا بین، زوو كوڕێك بدۆزینەوە و بەڵێن بەیەك بدەین هەر بۆ یەك ببین. دیارە ئەوەش كارێكی ئاسان نەبوو، چونكە بەئاسانی كوڕ و كیژێك نەدەگەیشتنە یەك، ئاسان نەبوو ئەو دوو گەنجە بەیەكەوە قسە بكەن و بوار ساز بێت، بەیەكەوە بەڵێن بدەن. كە ڕۆژانی یەكشەممەوان بۆ وانەی ئاین كۆ دەبووینەوە، لەوێ بوار دەبوو كوڕەكان ببینین، ئەوانیش لە ئێمە نزیك بكەونەوە.

لەو کۆڕە ئاینییەدا بۆ یەکەمین جار چاومان بە کوڕەکانی ناو کۆمەڵەکەی خۆمان کەوت، لە نزیکەوە بەیەکەوە قسەمان دەکرد، بۆیەش کیژەکان زۆرتر روویان لەو کۆڕانە دەکرد و زۆریش دەهاتن، لیندای خوشکیشم هاتە ناومان، بەردەوام لە وانەکان ئامادە بووین، هیچ دەرسێکمان دەرباز نەدەکرد، بۆیەش دایکم گومانی لەسەر دەرچوونەکانمان پەیدا کردبوو، چونکە ئێمە جاران ئەوەندە متووی چوونە کڵێسە و وانە ئاینییەکان نەبووین. دایکم کە گومانی لە ئێمە کردبوو، بە باوکمی وتبوو، ئەو کیژانە لە بەرچاوی ئەو کوڕانە دەچنە کڵێسە و هەموو یەکشەممەوان دواناکەون، بەڵام باوکم لەبەرئەوەی زۆر شانازی بەو دەرسە ئاینییانە دەهات، بۆیە گوێی نەدابووە قسەکانی دایکم، بە تێپەڕبوونی ماوەیەک لەو دەرسانە بۆمان دەرکەوت کەوا زۆری کیژ و کوڕەکانیان پێوەندیی ئەڤینیان لەگەڵدا بەستبوو، مانگانە سێ چوار جار دیمانەیان دەبوو. ئێمە بۆ بەیەکگەیشتن لەگەڵ دۆستەکانمان خۆمان لە باڵکۆنەکانەوە بۆیان فڕێ دەدایە خوارەوە، رۆژێکیان مامۆستایەک منی بینی کە چۆن لە پەنجەرەوە بۆ دەرەوە و ناو کۆگاکە خۆم فڕێ داوەتەوە خوارەوە تا بگەمە کوڕە سۆزدارەکەم، ئەو چی بینیبوو یەکسەر بە باوکمی وتبوو، ئەوەش لە ناو خێزانەکان بڵاو دەبێتەوە و هەموو کیژەکان لەسەر ئەو کردەوەیە سزا دەدرێن، بەڵام کە باوکم ئەو قسەیە دەزانێت شۆک دەیگرێت. باوکم دەزانێت من لەگەڵ کام کوڕ پێوەندییم هەیە و من لە پشتەوەی خێزانەکەمەوە کام کوڕ دەبینم، یەکسەر دەچێتە هۆشداری دەداتە کوڕەکە کە ناکرێ جارێکی تر لەگەڵ کیژەکەی ئەو قسە بکات، بۆ منیش هەمان هۆشداری کردبووم، بۆیەش هەردووکمان نەکرا یەکتری ببینینەوە، من لە کپکردنی ئازادییەکەم نارەحەت نەبووم من لەبەر خوێندنەکەم بوو کە نارەحەت بووم، چونکە دواناوەندییەکەمان تایبەت بوو بە رەوتێکی کۆمەڵەکەمان، مامە روی بواری نەدەداین بچینە قوتابخانەکەی تری رەوتەکەی تری کۆمەڵەکەمان، لەولاشەوە ئەوانەی سەر بە رەوتەکەی تری کۆمەڵەکەمان بوون دەمبینی منداڵی ناسیار و خزمەکانمان دەچوونە قوتابخانەکان.

ئەگەرچی ئێمە لەگەڵ خزمەکانمان سەر بەیەک رەوتیش نەبووین، بەڵام دۆستایەتیمان هەبوو. بەڵام کە لە خوێندن دابڕام لەگەڵ ئەوان لە یەکتری دوورکەوتینەوە و بوار ساز نەدەبوو یەکتری ببینینەوە، بۆیەش من هەستم دەکرد نائومێد دەبووم، هیچ بواری خوێندنم نەما بێجگە لەوەی من بە نامە بخوێنم، ئەو بژارەشم هەر باش بوو، خوێندنەکەم بەردەوام دەبوو، بەڵام لە برادەرەکانم دادەبڕام، هەستم دەکرد هیچ هاورێم نەمابوو.

باوکم کۆمپانیایەکی بیناسازی هەبوو، من لەوێ وەک فەرمانبەری پێشوازی دەستم بەکارکردن کرد، ئەگەرچی من حەزم لەو کارە نەدەکرد، بەڵام کارەکەم لا خۆش بوو تەنیا لەبەرئەوەی لە ماڵەوە دەردەچم و چی تر خەریکی منداڵ بەخێوکردن نابم، کە دەگەڕامەوە ماڵەوەش خۆم لە ژوورەکەم دەپەستا و خەریکی خوێندنی خۆم دەبووم، بەو جۆرە توانیم خوێندنی سێساڵی خوێندن بە یەک ساڵ تەواو بکەم.

## ئاراستەیەکی هەڵە

رۆژێکیان لە ناکاو و لە کردەوەیەکی چاوەڕوان نەکراودا مامە روی بڕیار دەدات، کیژەکانی دەرچوو و زیرەکەکان دەتوانن بچنە خوێندنی قوتابخانەکەی رەوتەکەی تری کۆمەڵەکەمان کە تایبەت بە کیژانی تیمەکەی تری رەوتەکەی ئەوانەوە بوو، دەبووایە ئێمەش ئەو پەیامەی مامە روی بە ماڵەوەمان بڵێین کە ئەو سیستەمە لەو قوتابخانەیە پەیڕەو دەبێت، کە باوکم گوێی لەو قسەیەی مامە روی دەبێت تووشی شۆک دەبێت، نایەوێت ئەو قسەیە بڕوا بکات چۆن دەکرێ هەردوو کیژەکەی من بچنە ئەو قوتابخانە تایبەتییە.

هەمووڵایەک ئەو پێشنیاز داوایەی مام روییان لا باش بوو، من دووبارە گەڕامەوە ئەو ژیانەی کە مەبەستم بوو، لە پاش یەک ساڵ دابڕان لە هاورێیەکانم لەو جیهانە جوانەی کە حەزم لێ دەکرد و شەیدای گەڕانەوەی بووم، لەو رۆژەوە هەستم کرد کە ئاراستەی ژیانی من چەند چەواشە و هەڵەیە، من کەسێکی بێ دەسەڵاتم و ژیانم تەژییە لەو کۆت و زیندان.

لیندای خوشکم هەستی بەوە کردبوو کەوا کەسێک هەیە شوێن پێمان دەکەوێت، کەسەکەش پیاوێکی بەتەمەنی گەڕەکەکەمان بوو، ئەو وتی من هەست دەکەم ئەو پیرەمێردە بەدوام دەکەوێت، دیاربوو تەمەنی سێ بەقەد تەمەنی لیندا دەبوو، لیندا لەو دەمانە تەمەنی حەڤدە ساڵ بوو. ئێوارەیەکیان کە باوکم دەگەڕێتەوەماڵەوە لە تەنیشت لیندای خوشکم جێ دەگرێت، نەرم نەرم دەیدەوێنێت، پرسیاری لێ دەکات وەک:

تۆ بۆچی تەنوورەی کورت لەبەر دەکەیت، بۆچی کە دەردەچێت و لەسەر شەقام دەڕۆیت پێڵاوی بەرز لە پێ دەکەیت، بۆچی حەز دەکەیت قژت بەو شێوەیە تەسریحە بکەیت. باوکم باسی ئەوەی لەگەڵدا دەکات کە رۆژانە چۆن دەرچووە و چی لەبەر بووە وەک چۆن پیرەکە ئەوی بینیبوو بەو شێوەیە باوکم پرسیارەکانی لە لیندا دەکرد، بۆیەش لیندا هەستی کردبوو پیاوە پیرەکە وەک جاسووس لە دوای ئەودا بووە. دایکم بەو ئیشە زۆر تووڕە دەبێت، دایکم وتبووی ئەو پیاوە راست ناکات من بە قسەکانی ئەو بڕوا ناکەم، بەڵام باوکم گوێی نەدایە گلەیی و تووڕەییەکەی دایکم، چونکە لەلای باوکم وایە ئەگەر ژن لەسەر حەقیش بێت، ئەگەر داواکەشی راست بێت، مافی ئەوەی نییە گلەیی بکات، ناکرێ ژنان قسە لەو مەسەلانە بکەن، ئەگەر مەبەستی بەرگریش بێت لە کیژەکەی، لەو رۆژەوە بۆمان دەرکەوت کەوا دایکم بە هیچ شێوەیەک ناتوانێت بەرگریمان لێ بکات؛ دایکم هەرچەند مەبەستی چاکەی ئێمەی هەبووایە هیچ دەسەڵاتی نەبوو، دایکم لەوە دەترسا ئەو پیرەمێردە ئەو قسانە کردبێت مەبەستی داخوازی هەبووە، چاوی لەسەر لیندا دانابێت، بۆیەش وا بەپەرۆشەوە سۆراخی کردووە.

وەنەبێ تەنیا دایکم ئەو بۆچوونی هەبوو، بگرە لینداش هەمان بۆچوونی هەبوو، چونکە دەزانرا کەوا کابرا کەسێکی دەستڕۆیشتووە و هێزی هەیە، ئەگەر لە سەرۆکی تایفەکەمان داوای هەر شتێک بکات، ئەوە سەرۆک لاری نابێت و داواکەی دەچێتە سەر و بۆی جێبەجێ دەکات، بۆ نموونە ئەگەر چاوی لەسەر لیندا دانابێت، ئەوە خوشکەکەم هیچ دەربازبوونێکی نابێت، چونکە

دایکیشی ناتوانێت قسە لە قسەی سەرکردە بکات و ئەگەر گلەیی و ناڕەزاییشی لەو داوایە هەبێت، ئەوە ئەویش ناڕەزاییەکەی دەکێشێتەوە و لیندا دەبێتە ژنی ئەو پیاوە ئەگەرچی ئەو چوار ژنی تری هەبوو.

## تاکە هیوای دەربازبوون

لیندا رووبەڕووی داوێکی توند هاتبوو، تاکە هیوای دەربازبوونی لەو کێشەیە و ئەو داخوازییە تەنیا ئەوەبوو رابکات، روو لە دەرەوەی کۆمەڵەکەمان بکات، بەوە دەربازی دەبێت، بەڵام دەسەڵاتی نەبوو، ئەو نەبەردییە بەو نەدەکرا، لەبەرئەوەی تەمەنی بەرەو هەژدە ساڵی دەچوو، هێشتا دەیتوانی داوای پارێزگاری یاسایی بکات.

لیندا دەستەخوشکێکی بەناوی کلۆدیل هەبوو، ئەویش شەیدای ئەوەبوو لەو کۆمەڵگەیە دەربازی بێت، ئەو ترسی ئەوەی هەبوو بکرێتە هاوسەری مێردی دایکی، ئەو ماوەیەکی درێژبوو پاش جیابوونەوەی دایک و باوکی لەگەڵدایکی لە شاری سۆلت لیک دەژیا، دایکی بەرەقی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد، ناچاری دەکرد ئیشو کارەکانی ناو ماڵەکەیان هەموو ئەو بەتەنیا راپەڕێنێت، منداڵەکانی بۆ بەخێو بکات، خاوێنکردنەوەی ماڵەوەی بۆ بکات، زۆریش دەترسا دایکی ناچاری بکات ئەو شوو بە مێردەکەی بکات، تا بەیەکجاری ببێتە خزمەتکاری ئەو و مێردەکەی. لیندا و کلۆدیل چاوەڕوانی ئەوە بوون تەمەنیان بگاتە هەژدە ساڵ و بوار ساز بێت خۆیان دەرباز بکەن.

کلۆدیل لە شارەکەیان دەستەخوشکێکی هەبوو ئەندامی کۆمەڵەی (ئێف ئێل دی ئێس) نەبوو، لە نزیکەوە ئاگەداری مەینەتییەکانی کلۆدیل بوو. ئەو هاوینەی من لە کۆمپانیاکەی باوکم کارم دەکرد، هەر دۆلارێکی وەرم دەگرت پاشکەوتم دەکرد. باوک و دایکم بۆ کارکردن سەفەریان کردبوو، لەو رۆژەوە رۆژی سەرپەرشتی خێزانەکەی ئێمەی دەکرد، لەو دەمانەدا لیندا هەڵسوکەوتەکانی ئاسایی نەبوو، رۆژێکیان دەستەخوشکێکی بەناوی (ئیلانی) لە ماڵەوە هاتە سەردانی لیندا، لەو رۆژە هەستم دەکرد لیندا کەلوپەلەکانی

کەم دەکاتەوە و کەرەستە تایبەتییەکانی لەناو دەبرد، زۆریشی لەو شتانە دایە دەستەخوشکە میوانەکەی، من سەرم لەو کارە نامۆیەی ئەو دەرنەدەچوو. لە سەعات نۆی شەو لیندا لە دەرگەکەی منی دا، چاو بەفرمێسکەوە بە منی وت، من بە هاوکاری چەند برادەرێکم خۆم دەرباز دەکەم، ئێوە چی تر من نابیننەوە و لە بەرچاوان ون دەبم. من هەرگیز رەچاوی ئەو رووداوە و ئەو کارەم نەدەکرد تووشی شۆک بووم. من لە لیندای خوشکم پرسی:

تۆ چۆن ئەوە دەکەیت، تۆ چۆن بڕوا بە کەسانی نەناس دەکەیت، تۆ ئەوانە ناناسیت؟

ئەو لە وەڵامدا وتی:

من لەگەڵ ئەوانەدا دەڕۆم با کەسانی بەدکاریش بن، من هیچم نییە لەدەستم بچێت، من ئەگەر لێرە مامەوە ژیانم دەڕووخێت، تۆ دەتوانیت بیست دۆلارم پێ بدەیت؟

من هەرگیز ئامادە نەبووم خوشکێکی خۆم بدۆڕێنم، ئەو پارەی پاشەکەوتم کردبوو، هەمووم لەدەستی ئەو کرد، ئەو ویستی تەنیا بیست دۆلار بگێڕێتەوە و وتی:

من تەنیا بیست دۆلارم پێویستە، ناکرێ من هەموو پارەکانی تۆ ببەم. من رازی نەبووم پارەکەی لێ وەرگرمەوە، لەو دەمانە بۆم نەدەکرا سەیری چاوە بەفرمێسکەکانی ئەو بکەم، ئەو منی لە ئامێز کرد و سوپاسی کردم، لەو دەمانە قسەی بۆ نەدەهات، بەگریانەوە لە ژوورەکەم دەرچوو. ئەو گەڕایەوە ژووری نووستنی خۆی، خەریکی کۆکردنەوەی کەلوپەلەکانی خۆی بوو، کە دەرگەی دەرەوەی کردەوە رۆزی هاتە ژوورەکە بزانی چ روو دەدات، ئەو لە منی پرسی ئەو کیژە کێوە دەچێت، منیش وتم دەیەوێ بڕوات، کەس ناتوانێت لەو رۆیشتنە و لەو بڕیارە رای گرێت، چونکە تەمەنی گەیشتووەتە هەژدە ساڵ، دەکرێ ئەو لەو تەمەنە خۆی بڕیار لەسەر چارەنووسی خۆی بدات، بۆیە رۆزی کۆششی کرد پەشیمانی بکاتەوە، بیگێڕێتەوە ماڵەوە، بەڵام بڕیاردانەکەی ئەو بەهێزتر بوو.

## پێش شووکردنم

## وەک پیاو تەنیا قسەم لەگەڵ باوکم کردبوو

لیندا لە ماڵەوە دەردەچوو، بڕیارەکەی دوا بڕیاربوو، ڕۆژێ هەڕەشەی ئەوەی لێ کرد تەلەفۆن بۆ باوکی دەکات، باوەژنەکەمان تەلەفۆنی بۆ باوکم کرد، ئەو لە هوتێل بوو، پاش چەند دەقەیەک چەند پیاوێک لە ماڵەکەمان ئامادە بوون، ئەوان ویستیان لیندای خوشکم لەو راکردن و دەرچوونە راگرن تا باوکم دەگەڕێتەوە، بەڵام کاتەکە تێ پەڕیبوو، سەرۆکی شارەوانییەکە گەیشتە ماڵەوەمان، ئەو هەندێ پرسیاری لە من کرد، ویستی لە منەوە بەرنامەکانی دوارۆژی لیندای خوشکم بزانێت، من راستییەکەم بە سەرۆک شارەوانییەکە وت، کەوا من ئاگام لە هیچ نییە، من نەمزانیوە ئەو بڕیاری دەربازبوونی دابێت، نازانم بەرەو کێندەرێش دەڕوات، من ئاگام لە هیچ بەرنامەی ئەو خوشکەم نییە.

باوکم و دایکم بەپەلە گەڕانەوە ماڵەوە لەگەڵ باوکی کلۆدیلی دەستەخوشکەکەی لیندا هێزێکی بیست پیاویان بۆ دۆزینەوە و گێڕانەوەی دوو کیژەکە ساز دا. باوکم زۆر بێزار و توورە بووبوو، رەوشی ماڵەوەمان تەنگ و تاریک بوو، هەمووومان خەمباربووین، هەموومان لە سەلامەتی لیندا دەترساین، دایکم لە هەموومان زۆرتر دڵتەنگ و نیگەران بوو، چونکە راکردنەکەی لیندا بۆ ئەو خراپ و ناشیرین دەکەوتەوە، کەوا ژنەکە نەیتوانیوە باش و تەندروست منداڵەکانی بەتایبەتی کیژەکانی گەورە بکات.

ئەگەر لیندا دووبارە بگەڕێتەوە ماڵەوەش تازە ئەو کەوتە دەرەوەی سنووری ژیانی ئێمە، ئەو تا ئەبەد نەدەهاتەوە دۆخی جارانی خۆی، نەدەکرا و بواریش نەبوو رەوشی ئەو جارێکی تر ئاسایی ببێتەوە، چونکە ئەو دەستوور و

ڕێنوێنییەکانی تایفەکەمانی پێشێل کردبوو، ئەوەی پێوەندیشی بەو کردبووایە ناوبانگی خراپ دەکەوتەوە، ڕاکردنەکەی ئەو جۆرێک بوو لە مردن بۆ خێزانەکەمان، من لەوە دڵگران بووم کەوا ئەو هیچ پیشەیەکی نەدەزانی، دەستوپێ سپی بوو، نەدەکرا بێ کارکردنیش گوزەران بکات، من خەمی ئەوەم بوو.

پاش چەند ڕۆژێک پیاوەکانی تایفەکەمان شوێنی دوو کیژە دەربازبووەکە دەدۆزنەوە، ئەوان لە شارۆچکەیەکی گچکەی نزیک شاری سۆلت لیک بوون، پیاوەکان ماڵەکە گەمارۆ دەدەن، سوور دەبن تا قسە لەگەڵ کیژەکان نەکەن شوێنەکە چۆڵ ناکەن، بەڵام لیندا و کلۆدیل قبووڵیان نەبوو قسەیان بۆ بکەن و ڕوویان بدەنێ، ئەو ژنەی ئەوانەی داڵدە دابوو، هەڕەشەی لە پیاوەکان کردبوو ئەگەر ناوچەکە و بەردەگەکەم چۆڵ نەکەن، من پێوەندیی بە پۆلیسەوە دەکەم، بۆیەش ژنەکە پۆلیسیان بۆ بانگ دەکات، ژنەکە قسەیەکی باشی لە دەست پیاوەکان نابوو، ئەو وتبووی ئەو دوو کیژە تەمەنیان گەورەیە و گەیشتوونەتە تەمەنی بڕیاردان، هەموو کەسێکی تەمەن هەژدە ساڵی حەقی بڕیاردانی تایبەتی هەیە، ئەوان دەخوازن چۆن و لە کێ بژین لەوەیاندا ئازادن، باوکم گەیشتە بەردەرگەی ماڵەکە، پۆلیس داوای لەویش کردبوو کە بڕوات، بەڵام باوکم وتبووی من ئەگەر لە سەلامەتی کیژەکەم دڵنیابووم دەگەڕێمەوە، من تەنیا دەمەوێ قسەی لەگەڵدا بکەم، بۆیەش بە پۆلیسەکانی وتبوو، دەکرێ بە کیژەکەم بڵێن کەوا من ڕەوشم زۆر خراپە، هەست دەکەم داوەشاوم و پێویستم بە دیتنی ئەو هەیە، بەڵام لیندا ڕازی نەبوو قسە لەگەڵ باوکم بکات، بەڵام کە باوکم سوور دەبێت لەسەر داواکەی و بەڵێن دەدات ئەگەر قسەی لەگەڵدا بکەم من دەڕۆم و بەرۆکی بەردەدەم، لە کۆتایی لیندا بەو مەرجانە ڕازی دەبێت.

## مانی "شەیدایی"

کە بواری باوکم دەدەن، ئەو پرسیار لەو دەکات و دەڵێت بۆ وات کرد؟

ئەو لە وەڵامدا وتبووی:

ئەو لە نێوان کۆت و ڕێنوێنییەکانی ئاین و نەریت و تایفەکەیاندا بێزاربووبوو.!

کە باوکم داوا لە لیندای خوشکم دەکات بگەڕێتەوە ماڵەوە، ئەو بەدڵنیاییەوە داواکەی ڕەفز دەکاتەوە، بۆیەش باوکم بەناچاری لەگەڵ پیاوەکاندا دەگەڕێتەوە ماڵەوە، لەودەمەوە لیندا و دەستەخوشکەکەی بڕیار دەدەن لەو شوێنە بگوازنەوە، یەکێک ئەو دوو کچە هەڵاتووە دەباتە شاری سۆڵت لیک، بۆیەش گەڕان و دۆزینەوەی خوشکم دەبێتە مەراق و شەیداییەکی بێ سنوور لە ناو ئەندامانی تایفەکەمان.

پاش گەڕانی چەند هەفتەیەک دووبارە لیندا دەدۆزنەوە، ئەوجارە گەڕان و پشکنینەکە لەلایەن ئەو کوڕە بوو کە لە سەردەمی قوتابخانە لیندای خۆش دەویست، کوڕەکە ناوی (ئەلما) بوو، ئەو مەبەستی هێنانی لیندای هەبوو، بەڕاستی خۆشی دەویست بەڵام ئەو لە بەشەکەی تری کۆمەڵەکەمان بوو، ئەوەش ڕێگربوو لەوەی بەیەکەوە هاوسەرگیری بکەن، چونکە دوو بەشەکەی کۆمەڵەکە زۆر نەریت و ڕەسمیاتیان لەیەک جیاوازبوو، کوڕەکە لیندا لە ریستورانتێک دەدۆزێتەوە، کە تێدا لیندا کاری کردووە، بۆیەش ئەویش بڕیار دەدات لەو ریستورانتە کار بکات و هەموو جۆرە یارمەتییەکی پێشکێش دەکات و ئاسانکارییەکانی بۆ دەکات، بەردەوامیش لە کاتی پشوودانەکانیاندا بەیەکەوە دەبن.

باوکم زانیبووی کەوا لیندا لە شاری سۆڵت لیک دەژیت، لەوێ سەردانی دەکات و قسەی لەگەڵدا دەکات، بۆیەش نەدەبوو چی تر لیندا بەشاراوەیی بژیت، باوکم یەک داوای لە لیندا هەبوو کە ئەو قسە لەگەڵ پێشەوای تایفەکەمان بکات لەگەڵ مامە روی بەیەکەوە قسە بکەن، گوێ لە

ڕێنوێنییەکانی ئەو رابگرێت، ئەگەر ئەوە بکات ئەوا باوکم دەستبەرداری دەبێت، چیتر سۆراخی ناکات، لیندای خوشکم بەڵێن بە باوکم دەدات لەسەر داوای ئەو پەیوەندی بە مامە رویەوە بکات.

لیندا دیمانەی مامە روی دەکات، لەوێ ئەو پێی دەڵێت

لیندا دەکرێ هەڵەکەت چا بکەیتەوە، ئەوەش بەوە دەبێت ئەگەر شوو بە پیاوێکی ساڵح بکەیت و لە ڕێنوێنییەکانی تایفەکەمان دەرنەچیتەوە. لەگەڵ سوپاسەوە لیندا داواکەی ئەو رەفز دەکات، کە مامە روی گوێی لەو قسەیەی لیندا دەبێت بە باوکم دەڵێت باشە چ ماوە بکەین، دەسەلات چییە، بۆیەش باوکم پێشنیاز دەکات با لیندا شوو بەو کوڕە بکات کە خۆی خۆشی دەوێت، ڕێگر نابین لەوەی شوو بە ئەلما بکات، ئەگەرچی ئەو لە بەشەکەی تری کۆمەڵەکەشمانە. مامە روی پێشنیازەکەی باوکم پەسەند دەکات و زۆریش پێی خۆش دەبێت، بەڵام ئەگەر لیندا خۆی وەک لایەنگیری مامە روی بهێڵێتەوە، با هەر کوڕەکە لە بەشەکەی تری تایفەکەشمان بێت، دیارە ئەوەش زۆر رووی داوە و سەری گرتووە. بەڵام ئەوەی رووی دا بەپێچەوانەی هیوا و بەرنامەکان کەوتووە، چونکە ئەگەر ژنەکە بچێتە سەر بڕوای رەوتەکەی تری کۆمەڵەکەیان، ئەوە ژنەکە لەلایەن خێزانەکەی نەفرەت دەکرێت و بە مردووی ئەژمارد دەکەن، بەڵام دەروازەی گەڕانەوەی بۆ دەکەنە سەرپشت، ژنەکە دەتوانێت بگەڕێتەوە بە مەرجێک دەستبەرداری پیاوەکەی بێت کە لە بەرەکەی دووەمی تایفەکەیانە، بە پەشیمانییەوە بگاتە لای پێشەوایەکەیان و داوا لەو بکات مێردێکی تری بۆ بدۆزێتەوە و لەبەر رۆشنایی ئەو یەکێکی تر لە بەرەکەی خۆیانی بۆ دەستنیشان بکات.

کوڕەکە و باوکی بانگ دەکەنە نووسینگەکەی مامە روی، ئەو لەوێ ئەوە رادەگەێنێت کەوا رازییە لیندا شوو بە ئەلما بکات، بەڵام باوکی کوڕەکە بەو داوایە رازی نابێت، چونکە کوڕەکەی ئەو هێشتا تەمەنی نەگەیشتووتە هەژدە ساڵ، با خوێندنی ئامادەیییەکەی تەواو بکات، ئینجا دەکرێ ژنی بۆ بخوازین، بەڵام ئەلما بەرووی باوکی هەڵدەستێتەوە و دیارییەکەی مامە رویی پێشەوا

ڕەت ناکەتەوە و بە شانازییەوە قبووڵی دەکات. لیندا لە ترسی بەشوودان ڕای کردبوو، وا ئێستا بۆ بەدەستهێنانی ئازادییەکەی شوو دەکات، ئەوەیان تاکە بژار بوو بۆ لیندا بۆ ئەوەی ژیانی ئاسایی ببێتەوە و بگەڕێتەوە ناو کۆمەڵگە.

## ئارامترین بەدکاری

ئەگەرچی کیژەکە بەقسەی مامە ڕوی کردبوو، داواکەی پێشەوا بەچاوان جێبەجێ دەکات، بەڵام هێشتا لیندای خوشکم بە ژنێکی نەفرەتلێکراو و یاخی سەیری خۆی و پرۆسەکەیان دەکرد، چونکە ئەو شووکردنی بە پیاوێکی ساڵحی ڕەت دەکاتەوە، واتە بەقسەی پێشەوا شووی نەکردووە، ئەو بە زەواجی مەدەنی شووی کردووە.

ئاهەنگ و زەماوەندەکەی لیندا لە شێوەی پرسەیەک و بەئامادەبوونی دایکم و باوکم و دایکی ئەلما کرابوو، چونکە باوکی کوڕەکە بەو بڕیارەی کوڕەکەی دڵخۆش نەبوو، بۆیەش ئامادەی زەماوەندەکە نەبوو، چونکە ئەو جۆرە هاوسەرگیرییەی بە بەدکارییەکی نیمچە ئارام دەزانی. کە هەموو لایەکمان لە ساڵۆنی مارەکردنەکە دەرچووین گوێم لێ نەبوو باوکم یەک وشەی شیرین بە لیندا بڵێت، قسەیەکی لەگەڵدا بکات کەمێک لە ڕەوشی خەمەوە دووری بکاتەوە، ئەو وەک ژنێکی نەفرەتلێکراو گەڕایەوە سەر چارەنووسە تاڵەکەی جارانی خۆی.

پاش چەند ساڵێک من دووبارە لیندام دۆزییەوە، هەستم کرد ئەو دڵشکاویی پێوە دیاربوو، بەدڵی خۆی و لە کاتی خۆی شووی نەکردبوو، چونکە لەو ڕۆژەوە وەک ئەندامێکی خێزانەکەمان قبووڵ نەبوو. پاش چەند مانگێک زانیمان کەوا لیندا سکی هەیە، بەڵام ئەوەیان بۆ باوکم مەسەلەیەکی بایەخدار نەبوو، مەبەستی نەبوو نە منداڵەکەی ببینێت و نە بە هیچ شێوەیەک یارمەتییەکی بدات، بۆیەش ئەو هەردوو منداڵەکەی کیژەکەی نەبینی.

من لە دەرسە بەژانەکەی لیندا زۆر شت فێر بووم، کەوا دەربازبوون

چارەیەکی باش نییە، چونکە ئەگەر دەربازیشم بێت ئەوە من دەدۆزرێمەوە، بۆیەش لەسەر حاڵەتێک ناچار دەکرێم تەژی دەبێت لە خەم و پەژارەیی.

پاش کۆششێکی زۆر باوکم بواری منی دا بچم لە پەیمانگەیەکی پیشەیی بخوێنم، لەوێ من لەگەڵ مامۆستای دورمانەکەمان دۆستایەتییەکی گەرمم پەیدا کردبوو، ئەو زۆر شتی فێر کردم، یارمەتی زۆری دەدام، نەکەر ئەرکەکانم تەواو دەکرد، بواری دەدام زووتر بگەڕێمەوە ماڵەوە. کە من زووتر لە دورمانەکەم دەبوومەوە و مامۆستاکەم بواری گەڕانەوەی بۆ ماڵەوەی دەدام، ئەوەیان باش هەڵکەوتبوو، چونکە بەردەوام کەسێک بەناوی (بریگهام) بەدواوەم بوو، ئەو خشتەی وانەکانی منی دەزانی چاوەڕوانی دەکرد و دەهاتە شوێنم، بەڵام کە مامۆستاکەم زووتر ئیزنی دەدام ئەو بەرنامەکەی پێ کۆنترۆڵ نەدەکرا تا بێتە شوێنم، من ئەو کوڕەم نەدەناسی بەهیچ شێوەیەک قسەم لەگەڵدا نەکردبوو، زووتر لە قوتابخانەش بەیەکەوە نەبووین، ئەوەی من دەمزانی ئەو یەک ساڵ لە من گەورەتر بوو، بۆیەش لە قۆناغەکانی خوێندن هەرگیز هاوپۆلی من نەبووە، تەنها یەک کۆرسمان بەیەکەوە بووە و ئەو لەوێیەوە منی دیبوو و شەیدای من بووبوو، بۆیەش بەردەوام سۆراخی دەکردم.

## پرنێسیس دیانا

ئەگەر باوکم بیزانیبووایە کوڕێک بەردەوام لە ڕێگەی مەکتەب بەدوام دەکەوێت، بێگومان لە چوونە ئامۆژگەکە قەدەغەی دەکردم، بەوەش خوێندن و ئازادییەکەم لەدەست دەدەم، ئەوەش بۆ من خەم و کارەساتێکی مەزن بوو، چونکە من بۆ ئەو دەرچوون و ئەو خوێندنە کۆششی زۆرم کردبوو، وەک چۆن چاوەڕوانم دەکرد، وا دەرچوو، پاش چەند هەفتەیەک یەکێک بە باوکمی وتبوو کەوا کوڕێک بەناوی بریگهام بەردەوام سۆراخم دەکات، رۆژێکیان باوکم بانگی کردم و قسەی لەگەڵدا کردم، ئەو بە منی وت، ئەوەی تۆ دەکەیت پێشێلکردنی فەرمانی کردگارە، چونکە بەپێی ڕێنوێیییەکانی تایفەکە ژن دەبێ سۆزەکانی بۆ ئەو پیاوە هەڵگرێت کە شووی پێ دەکات و لە دواڕۆژدا دەبێتە هاوسەری.

من وەک پاڕانەوە لەگەڵ باوکم قسەم کرد، پێم وت من ئاگەداری هیچ نیم، من بە هیچ شێوەیەک پێوەندییم بەو کوڕەوە نییە، من چەندین جار ئەو کوڕەم لە خۆم دوورخستووەتەوە، باش بوو لەودەمانە (ئەنیتا)ی خوشکم هاتە نێوانمان، ئەو بە باوکمی وت، من هەموو راستییەکان دەبێژم، بڕوام پێ بکە، خوشکم هیچی لەگەڵ ئەو کوڕە نییە، بەوەیان باوکم قەناعەتی کردبوو، بۆیەش باوکم دەچێتە گژ باوکی کوڕەکە، کەوا بریگهام واز لە کیژەکەی ئەو بهێنێت، بەوەیان دڵم خۆش بوو، کەوا رێگەی خوێندنی زانکۆم لێ نەگیرا و بڕوانامەکەشم وەردەگرم.

وەرگرتنی بڕوانامە بۆ من سەرکەوتنێکی مەزن بوو، گۆڕانێکی گەورە بوو لە ژیانمدا، چونکە دەستەکەی ئێمە یەکەمین دەستەبوو لە قوتابخانەی ئامادەیی شاری کۆلۆرداو دەربچێت، نەک ئێمە هەموو ئەندامانی تایفەکەمان دەرچوونی ئێمەیان بە سەرکەوتنی هەموو تایفەکە دەزانی، چونکە حەوت ساڵ بوو منداڵەکانی ئەو تایفەیە لە قوتابخانەکان دابڕابوون.

داوایان لە ئێمە کرد بەیانی زوو بۆ وێنەگرتن خۆمان ساز بکەین، هەموومان بۆ شوێنی ئاهەنگەکە دەچووین، بەڵام بەداخەوە ئەو رۆژە ئاهەنگەکە نەبوو، زۆریش چاوەڕوان بووین ئەو کات و ئەو ساتە هەر نەهات، مامۆستاکان نمایشەکانیان بەبێ ئاهەنگەکە بەڕێ کرد. یەکێک لە کیژە هاوپۆلەکەمان (ئودری) لەبەرئەوەی لەسەر شێوازی پرنێسیس (ئەمیرە) دیانا خۆی دەڕازێنێتەوە بۆیە درەنگ دەگاتە شوێنەکەمان، بە رێوڕەسمی ئاهەنگەکە ناگات، کە هەموو لایەک ئەویان بەو جلەوە بینی سەرسام بوون، ئاهەنگەکە ساتێک بۆ جوانی ئەو دەوەستێت ئینجا ئاهەنگەکە بەردەوام دەبێت، پاش پێنج دەقە ناوی من خوێندرایەوە و منیش بۆ وەرگرتنی بڕوانامەکەم چوومە پێش سەکۆیەکەی پێشوازی، وەرگرتنی ئەو بڕوانامەیە وەچەرخانێکی مەزن بوو لە ژیانی مندا.

کە لە ئامادەیی دەرچووم ماوەی یەک ساڵ وەک یاریدەری مامۆستا کارم کرد، پێش ئەوەی داخوازی وەک مامۆستا پێشکێش بکەم، دەبووایە هەفتەیەک

دەرسێک لە یەکێک لە کۆلێجەکان وەرگرم، ئەوەش دەبووە پشتیوانییەک بۆ دۆزینەوەی کـار و لێـزانینی زۆرتری زانیـاری، بەوەش دەکـرا بۆ کـاری دەرسوتنەوە ساز بم. ئەودەمانە من تەمەنم گەیشتبووە هەژدە ساڵ، من زۆر حەزم دەکرد ببمە پزیشکی منداڵان، بەڵام بۆ ئەو خوێندنەی کە لە زانکۆ بوو، دەبووایە لەگەڵ باوکم قسە بکەم، کە قسەم لەگەڵدا کرد، باوکم وتی، منیش پێم باشە، بەڵام بەپێی داوونەریتی کۆمەڵەکەمان بۆ ئەوەی کیژێک بچێتە زانکۆ دەبێ لەگەڵ پێشەواکەمان دانوستان بکەم، دەبووایە ئەو بەو کارە رازی بێت.

شەوێکیان لە ژووری نووستنی خۆمەوە خەوتبووم، باوکم بە هێمنی لە من دێتە ژوورەوە و بەئاگام دێنێت، کە بەئاگام دەهێنێت پێم دەڵێت، کیژم وریا بە من کارێکی گرینگم بە تۆیە، وەرە ژووری نووستنەکەمان، کە چوومە ژوورەوە بینیم دایکم بەئاگـایە و زۆریش ئاسـایی بوو، باوکم بەو شـەوە درەنگە دەیویستە ئەوەم پێ بڵێت کەوا مامە روی رەزامەندی لەسەر دامەزراندنی تۆ وەک مامۆستا دەربڕیوە، بەڵام وتویەتی پێش ئەوەی دەست بە دەوام بکات ئەو کـیژە شـوو بکات، بڕیاری شـووکـردنی تۆشی داوە و مـێـردەکـەشی بۆ دیارکردوویت، ئەویش (میریل جیسوب)ی بۆ تۆ داناوە.

### سەفقە

کە قسەکانی باوکم بیست و لە مەرج و رەزامەندی مامە روییم زانی تووشی داوەشـانی کـردم، ئەودەمـانە بوو کـە داهـاتووم دۆڕاند، گـریمان رەزامـەندیم لەسەر شووکردنەکە کرد و چوومەوە بەر خوێندن، من چۆن سک و زار بکەم، من منداڵم هەبێت چۆن خوێندنم پێ دەکرێت.

من ناوی میریل جیسوبم بیستبوو، چونکە کیژەکانی ئەو لە قوتابخانە لەگەڵ مندا بوون، لە منداڵەکانییەوە دەمزانی لە ماڵەوە باش نییە، ئەوان لەسەر هەڵسوکەوتەکانی باوکیان بەردەوام گلەییان هەبوو. ئەو زۆر لە من

بەتەمەنتر بوو، نەک لە تەمەنی باوکم ، ئەو تەمەنی باپیرەمی هەبوو.

بە ترسەوە بە باوکم وت:

باوکە ئەو پیاوە چۆن رازی دەبێت منداڵێکی وەک بکاتە هاوسەری خۆی؟

باوکم مەسەلەکەی بۆ راڤە دەکردم و زۆر قسەی بۆ کردم بە جوانی تێی گەیاندم کەوا بڕیارەکە لەلایەن سەرۆکی کۆمەڵەکەمانەوە دراوە و ناکرێ سەرپێچی بکەیت و لە ناو تایفەکەمان ئابڕوومان مەبە. باوکم لەگەڵ میریل قسەی کردبوو، رۆژی زەماوەندەکەشیان دیار کردبوو، بڕیار درابوو من رۆژی شەموو بگوازرێمەوە، واتە تەنیا دوو رۆژمان لە بەردەست دابوو هەموو پێویستییەکان ساز بکەین، لەو دەمانە هەستم بەوە دەکرد کەوا ژیانم بەیەکجاری فەوتا، بۆیە من بیرم لە دەربازبوون دەکردەوە، بەڵام بەرەو کام شوێن رابکەم، حاڵەتە خراپەکەی لیندای خوشکم دەهاتەوە پێش چاو، کەسم بەدەستەوە نەبوو یارمەتیم بدات، بۆیەش لەو حاڵەتەدا من دەستەوەستان بووم.

من کەسم لە دەرەوەی گەرەکەکەی خۆمان نەدەناسی، نەمدەزانی چ بڕیارێک بدەم، باوکیشم بواری نەدام بچمەوە ژوورەکەی خۆمەوە، وتی دەبێ لەگەڵ دایکت لە ژوورەکەی ئەو بخەویت، بەیانی زوو بەیەکەوە دەچینە لای میریل، لەو دیمانەیەدا دەکرێ یەکتری بناسن، ئەویان بۆ خواردنی بەیانی داوەت کردبوو. لە ماڵەوە چاودێرییان دەکردم، دایکم بەردەوام چاوی لەسەر من بوو، بواری نەدەدام یەک چرکەش لەو دوور بکەومەوە، تا ئەو دەمانەی کاتی زەماوەندەکە دێت، ئەوەش رێگەی هەڵاتنیان لە من گرتبوو، هیچ بوارێکی دەربازبوونم نەبوو، چونکە ئەوان لە هەڵاتنەکەی لیندا زۆر شەرمەزار بووبوون، بۆیە هەموو سازییەکیان کردبوو، زەماوەندەکە بەخێرایی و بەوریاییەوە بکرێت. من بە باوکم وت، باشە باوکە من رازیم بەو شووکردنە و بە فەرمانی سەرۆک، بەڵام من خەمی خوێندن و تاقیکردنەوەکانمە، ئەویش لە وەڵامدا وتی:

خەم مەخۆ کیژم ئەوانە گرینگ نییە، ئەوەی گرینگە و لەلای ئێمە پیرۆزە قسەی مامە روی نەشکێنین و شەرمەزار نەبین.

بەیانی بەناو شاری بیج لە ویلایەتی ئریزونا گەیشتینە شاری بلفروگ، لەوێ میریل کۆمپانیایەکی گەورەی بیناسازی هەبوو، رۆژانە بەردەوام لەو شوێنە دەمایەوە و کارەکانی بەڕێوە دەبرد. میریل لە کاتی نانخواردنەکەی بەیانی یەک سەعات دوا کەوت، ئێمە لەسەر ئەو نەوەستاین، نانەکەمان خوارد، لەگەڵ ئەو بەیەکەوە قاوەکەمان خواردەوە، کەمێک لەگەڵ باوکم قسەی کرد و هەڵسا رۆیشت. لەوێ وتبووی من بەهەڵە داوای ئەو کیژەم کردووە، دوایی ئەو قسەیەم زانییەوە، دیاربوو ئەو چاوی خستبووە سەر ئەنیتای خوشکم، ئەودەمانە ئەو تەمەنی تەنیا شازدە ساڵ بوو، ئەو لە ناو ماڵەوەمان لە هەموومان جوانتربوو.

پاشان زانیبوومان کەوا میریل دەچێتە لای مامە روی، لەوێ شکایەت لە باوکم دەکات، لە ئاکامی سەفقەیەکدا لەگەڵ باوکما کردوویەتی کە تێدا ئەو زیانی بەرکەتووە و مەسەلەکەیان گەیشتووەتە دادگا، مامە روی پێشنیازی بۆ دەکات تا مەسەلەکەتان حەل بێت و زیانەکەتان بەرنەکەوێت، واچاکە تۆ کیژێکی ئەو بخوازیت، کە ژن و زەماوەندی تێ کەوت، ئاڵۆزییەکان چاک دەبێتەوە، پیاوەکەش زووتر ئەنیتای خوشکمی بینیبوو، بەڵام ناوەکەی لەگەڵ من لێ تێکەڵ دەبێت، لە جیاتی ناوی ئەو بڵێت ناوی منی وتبوو، کە راستییەکەشی بۆ دەردەکەوێت ناکرێ پەشیمان ببێتەوە، چونکە ئەو لە پێش پیاوە پیرۆزەکەی تایفەکەمان قسە و بەڵێنی داوە.

## سەرەتایەکی خراپ

کە لە رێستورانتەکەی بلفروگ هەڵساین من لەگەڵ دایکم بۆ کڕینی جلی بووکێنی زەماوەند دەرچووین، لە ناو کیژانی کۆمەڵەکەمان وا باوبوو کەوا رۆژی دیاریکراوی زەماوەندە نازانین، رۆژەکە زووتر دیاری ناکرێت، رەنگە دوو سەعات پێش ئاهەنگەکە بە بووکەکە دەڵێن، بۆیە زوو و بەپەلە دەبێ جلەکان ئامادە بێت. لەگەڵ گەڕانەوەمان بۆ ماڵەوە دایکم دەستی کرد بە سازکردنی فستانەکەی بووکێنی من، شەو تا درەنگ ئەو خەریک بوو، منیش پێوەندییم بە

قوتابخانەکەمەوە کرد کەوا من ناتوانم تاقیکردنەوەکەم ئەنجام بدەم، مەسەلەیەکی لە ناکاوم هاتووەتە پێش، دیارە ئەوانیش دەیانزانی شتێکی نادرست رووی داوە، بەڵام حەقی ئەوەیان نەبوو پرسیار بکەن. باوکمان لێمان بەڕووڕێ کەوت و وتی:

دەی کیژم خۆت ساز بکە، وا میریل هاتووە دەیەوێ پێش گواستنەوەکەت بچیتە ماڵەکەی ئەو لەوێ لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی یەکتری بناسن، ئاهەنگەکەشمان لە شاری سۆلت لیک دەبێت. پێغەمبەرەکەشمان لە شاری سۆلت لیک دەژیا، لە ماڵەوەش حەزیان نەدەکرد گواستنەوەکەم دوا بکەوێت، ئەوەک منیش وەک لیندای خوشکم ڕا بکەم و لەو کۆمەڵەیە خۆم دەرباز بکەم.

میریل لێمان بەڕووڕێ کەوت هەمووومان لە مەتبەخەکەمان بووین سڵاوی لە ئێمە کرد، ئەو دەیزانی لەگەڵ دەرچوونیدا من یەکسەر بڕۆم بە شوێنی ئەو، دیارە منیش وام کرد و بەدوای کەوتم، ئەو لە ناو ئۆتۆمۆبێلەکەی چاوەڕوانی دەکردم، خۆشی ئەزیەت نەدا دەرگەی ئۆتۆمۆبێلەکەشم لێ بکاتەوە، منیش دەرگەکەم کردەوە و چوومە تەنیشتی دانیشتم، من لەو ڕەوشە تێ گەیشتم ئەوەیان سەرەتایەکی خراپ بوو، هەردووکمان یەک وشەمان لە دەم نەهاتە دەرەوە. من لەگەڵ پیاوان هیچ ئەزموونم نەبوو، هەرگیز لەگەڵ یەک پیاو نەبووم، پێوەندیی ئێمە بە پیاوان قەدەغە و حەرام بووە، لە کولتووری ئێمە ئەو پێوەندییە شیاو نەبووە، بۆشمان نەبووە لەگەڵ کوڕانیش دیمانەمان بووبێت، هیچ بوارو ڕێگایەکیش بۆ سووڕانەوە لەسەر ئەو مەسەلەیە نەبوو، من تاکە پیاوێک قسەم لەگەڵدا کردبێت باوکم بووە، هەرگیزیش ئەو پیاوەی کە دەبێتە هاوسەرم نە پێشتر دەمناسی، نە یەک جاریش ئەوم دیبوو، بەڵام لە ماڵەوە ناوم بیستبوو کەوا سەردانی باوکمی دەکرد و بەیەکەوە کاریان هەبووە و لەسەر کارکردن قسەیان هەبووە.

## فیلمێکی ترس

من کە لە ناو پاسەکەی ئەو لە تەنیشتی دانیشتبووم هەستم دەکرد فیلمێکی ترس روو دەدات، ئەوەش بوویتــە راسـتـی و هیـچ دەربازبـوونم نەبـوو، بواری هیچم نەما، لەو دەمانە ئەوەم بەبیردا هات، کە بەو بڵێم:

دەزانـی مـن تۆم نـاوێت، دیـارە تۆش منـت نەویـسـتــووە، تکـایە بمگەڕێنەوە ماڵەوە.

بەڵام ئەو بژارە و ئەو قـسـەیە نەدەبوو، تـا گـەیشـتـینە مـاڵەکـەی ئەوان هەردووکـمـان یەک قسـەمـان لە زار نەهاتەدەر، کە گەیشـتینە ناو خێزانەکەی ئەو داوای لە منداڵەکانی کرد، وەرن دایکە نوێیـەکـەتـان ببینن. هەمـوومـان لە ژووری دانیـشـتن بەیەکەوە دانیـشـتین کە ژمـارەمـان دەگەیشـتـە نزیکەی چل کەس، لەبەرئەوەی من خـۆم زۆر حەزم لە تێکەڵبـوون نەبوو، بۆیە لەو شـوێنەدا دڵم خۆش نەبوو، میریل فەرمانی بە ژنەکەی کرد کەوا من لە باوەش بکات، من هەستم کرد (باربرە) بە چاوێکی دوژمنانە و بەرقەوە سەیری منی دەکرد.

مـیریل منی گەڕاندەوە مـاڵەوە، پاش چەند سـەعـاتێک بینم مـیریل هەر سێ ژنەکەی و کیـژەکانی هێنایەوە ماڵەوەمـان، میریل فەرمانی بەوان کرد یارمەتی دایکم بدەن تا کەلوپەلەکان سـاز بکەن، دوا نەکەون و بەخـێـرایی فسـتـانەکە ســـاز بکەن، ئەو وتی نـاکـرێ زۆر چاوەڕوان بین چونکە درەنگە. لە کــاتـی نیشـانکردنەکە و زانینی بەشـوودانم و دیتن و جل سـازکـردنەکە تا ئەودەمـەی بەکـاروانێکی گـچکەی ئۆتۆمـۆبێلەوە منیـان بـەجلی بووکـینی گـەیاندە مـاڵی مێردەکەم لە شاری سۆلت لیک، هەمووی تەنیا ٤٨ سەعاتی خایاند. من لە ناو ئۆتۆمۆبێلەکەی لە پشتەوە دانیشتبووم، ماوەمـاوە میریل دەهاتە لای باوکم و قسـەیان لەسـەر کـار و بازرگانی دەکرد، بە هیچ شێوەیەک حـیسـابی بوونی منیان نەدەکرد.

من پاشـان زانیم من بوومــەتە بەشێکی سـەفقـەیەکی بازرگانی، کـە باوکم لەلایەن مـامـە روییـەوە داوا کـرابوو، لەوێ ئـەو بڕیار دەدات باوکم کـیـژەکـەی

بداتە میریل مەسەلەکە دەبڕێتەوە، باوکم هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو، چونکە ئەو مێشکی بەوە شوراوەتەوە کەوا ئەوەی ئەو وتوویەتی وەک خۆر روون و راستە، دیارە ئەوەش پرۆسەیەکە لە شووشتنی مێشک و بەس. من بە هەموو حەز و ئارەزووەکانەوە نەمدەویست ئەو پیاوە دەستم بداتێ، بەڵام ئەوەم دەزانی ئەوەش دانانێکی خوایییە و دەبێ گوێڕایەڵ بم و بە هیچ شێوەیەک سەرپێچی نەکەم. من تەمەنم گەیشتبووە هەژدە ساڵ، لەو دەمانە باش بڕوام بەوە هەبووە کەوا مامە روی پێغەمبەری خوایە، سەرپێچی ئەویش هەڵگەڕانەوە و نکۆڵییە لە مەولاکەمان.

بەهەرحاڵ ئێمە گەیشتینە شاری سۆلت لیک، لە هوتێلێکی گچکە دابەزین، دایک و باوکم و ژنی دووەمی میریل کە ناوی (رۆزی)بوو لەوێ بوون، ئەوەشیان شەوی یەکەمم بوو لەگەڵ میریل لەو هوتێلەدا.

## قوربانییەکە

من هەتا ئەودەمانە نە لەگەڵ ئەو و نە لەگەڵ کەسی تر بیرم لە سێکس نەدەکردەوە، من هەتا ئەو رۆژە هیچ پیاوێک دەستی لە من نەدابوو، پێوەندیی سێکس و پێوەندیی رۆمانسییم لەگەڵ هیچ پیاوێکدا نەبوو، لە بیرمە جارێکیان کوڕێک منی ماچ کردبوو لە گەڕەکەکەمان کێشەیەکی گەورەی لێ کەوتووە، بەڵام من ئێستا لەگەڵ ئەودا کاری سێکس بکەم و ببمە هاوسەری پیاوێکی سی و دوو ساڵ لەخۆم گەورەتر بە کارێکی ترسێنەرم دەزانی. کیژەکانی هاوتەمەنی من لە ناو کۆمەڵەکەمان کە بەو جۆرە شوویان دەکرد تەنیا لەبەر ئەوەیان بوو سەری ماڵەوەیان بەرز بکەنەوە و خێزانەکانیان شەرمەزار نەکەن، لە شەوی بەزاوابووندا هەستم دەکرد من بوومەتە قوربانی خێزانەکەم و داوونەریتی کۆمەڵەکەمان، پێش ئەوەی بچینە ناو ئاهەنگەکە میریل لە شاری سۆلت لیک لە ماڵەکەی خۆیدا سەردانی مامە روی کرد، رەنگە هەواڵی زەماوەندەکەی پێ راگەیاندبێت، منیش لە ناو ئۆتۆمۆبێلەکەوە چاوەڕوان بووم، دیارە بەیەکەوە قسەیان لەسەر مەسەلەیەکدا هەر هەبووە.

باوکم لە من نزیک کەوتەوە و چرپاندییە بن گوێیەکانم و وتی:

کارۆلین گوێ بگرە، ئەو پیاوە پیاوێکی باشە، دەبێ تۆ رێزی میریلی مێردت بگریت. بەوەش ئەو تۆ و منداڵەکانی تۆشی خۆش دەوێت. کە سێکس و منداڵبوونم بەبیر دەهاتەوە تووشی شۆک دەبووم.

لە نووسینگەکەی مامە روی ئەو داوای لێ کردم من لە تەنیشت میریل بوەستم، ئەو دەستی گرتم، بەڵێنمان بەیەکتری دا، کە بەڵێنەکەم دا هەستم بە ونبوون دەکرد، سوێندخواردن و بەڵێنەکەمان بە دەست لەملکردن کۆتایی پێ هێنا، هەموو شتەکان بە جدی دەکران، بەڵام من بە هیچ شێوەیەک هەستم بەئارامی نەدەکرد.

## خوێندکارانی زانکۆ هەڵسوکەوتی وایان لەگەڵدا دەکردم، وەک ئەوەی من لە هەسارەیەکی ترەوە هاتوو بم

هەتا ئەو کاتەی میریل (باربرە)ی نەهێنابوو، دارکاری (ڤۆنیتا)ی ژنی نەدەکرد، بەڵام ئەو ژنەی نوێیەی هانی مێردەکەی داوە ئازاری جەستەیی ئەو و منداڵەکانی بدات، ژنەکەش لە منداڵەکانی ئەویان دەدا، کە باربرە لە منداڵەکانی ئەوی دەدا مێردەکەی دەستی نەگرتووە و وەحشیەتییەکەی رانەگرتووە.

باربرە زۆر دژایەتی ڤۆنیتای دەکرد، دەیویست لە ماڵەکەی دەری پەڕێنێت، کەیفی بەو ژنە نوێیەی میریل نەدەهات، بۆیە پاش هەژدە مانگ لە مانەوەی لەلای مێردەکەم، ژنەکەی بەرگەی نەگرتووە و رۆیشتووە، ئەگەرچی تەمەنی گەورەش نەبوو، ڤۆنیتا تەمەنی تەنیا سی و دوو ساڵ بوو، باربرە لەگەڵ هەوێیەکەی تری کە ناوی رۆس بوو وانەبوو، رێزی دەگرت و هەراسانی نەدەکرد، چونکە ژنەکە خزمی خۆی بوو، کە دەیزانی لەگەڵ مێردەکەشی پێوەندی گەرمە بۆ ئەو قسەی نەدەکرد.

ئودری دەیوت دایکم بەردەوام رووبەڕووی لێدان و سووکایەتی دەبووەوە سەرەتا لەلای میریلی مێردی گلەیی کردووە و باسی کردووە، بەڵام کە زانیوویەتی قسە و شکایەتەکانی سوودی نەبوو، رادەستی ئەو واقیعە بووە کە شانس بۆی بڕیوەتەوە و زۆربەی کاتەکانی بە سەیرکردنی بەرنامەکانی تەلەڤزیۆن بەسەردەبرد، ئەگەرنا لە ناو جێگەکەدا ئەگەر خەویشی لێ نەکەوتبووایە لە ناو سیسەمەکەی گلینگلی دەدا و دەنووزایەوە، تا کەمێک ئارام بێت و خۆی لە بیر بکات حەبی نووستن و ئارامبوونەوەی خواردووە، کیژەکە دەڵێت من بەردەوام دەمبینی دایکم بێ ئاگا و خەواڵوو بوو، ئەوەندە

حەبی دەخوارد من وام دەزانی مردووە، زوو دەچوومە لای باوکم و دەموت وەرە دایکم گیانی دەرچووە و مردووە، بەڵام ئەو گوێی نەدەدامێ، لە شوێنی خۆی نەدەجولایەوە، بۆیەش منیش شۆک دەبووم.

ئەو ژنە ماوەی چواردە ساڵ خێزانەکەی کۆنترۆڵ کردبوو، هەموو ئەندامانی خێزانەکەمان روحیان لە باربرە دەچوو، کەس بۆی نەبوو بەڕووی بوەستێت، هەموویان هیوایان دەخواست باوکیان دڵی بچێتە ژنێکی تر، یەکێکی تر بێنێتەماڵەوەیان بەڵکو باوکیان کەمێک دڵی لەسەر باربرە سارد بێتەوە و دەسەڵاتی ئەو ژنە لەو ماڵە لاواز بکات. منیش بە کیژەکەم دەوت:

ئەگەر دەسەڵات و هێزی ئەو ژنە ئەوەندە بەهێزبێت چۆن دڵی باوکت دەکەوێتە سەر ژنێکی تر، دیارە ئەویش دەرەقەتی نایێت. کە ئەو راڤەی منی بیست کیژەکە بێدەنگ دەبوو، وەڵامی نەبوو. بەڵام وتم، دەبێ من رێگەچارەیەک بدۆزمەوە، من بتوانم هەست و سۆزی میریل بۆ لای خۆم بجوڵێنم، ئەوەیان بە من دەکرێت، دەبێ وا بکەم ئەو منی خۆش بووێت، چونکە باشم دەزانی من تازە بوومەتە ژنی ئەو، چارەنووسم لەگەڵ ئەودایە، ئەگەر خەمێ لە حاڵی خۆم نەخۆم منیش وەک (رۆس)م لێ دێت، وەک دایکی خۆم بەسەر دێت.

## خوێندنی رەفاهیەتێکی زیادە

من توانیم سەرنجی ئودری بۆ خۆم راکێشم، ئەویش کۆششی دەکرد یارمەتی من بدات، منیش پەیداکردنی برادەرێکم لە ناو خێزانەکە بەپێویست دەزانی، بەڵام مەبەستم نەبوو میریل بکەوێتە ناو تۆڕی ئەڤینی من، چونکە ئەوەیان دوا شت بوو کە داوام دەکرد، چونکە نەدەکرا من کەسێکم خۆش بووێت تەمەنی سێ جار بەقەد تەمەنی من بێت، من تاکە هیوام ئەوەبوو خوێندنەکەم تەواو بکەم، بەڵام ئەو قسەیەم لەلای ئودری نەدەدرکاند، ئەگەرچی ئەو زۆر باسی ژانەکانی دایکی دەکرد و زۆریش قسەی لەلای من دەدرکاند، ئەو هێشتا لای باوکی بەر نەدەدا و باوکی خۆی زۆر خۆش دەویست.

دەبووایە من بە زووترین کات بچمەوە سەر خوێندنەکەم، چونکە ئەوەم باش دەزانی میریل من لە ماڵەوە ناهێڵێتەوە و لەگەڵ خۆیدا کاری دەوامی بەردەوامم پێ دەکات، یان ناچارم دەکات لەگەڵ باربرە بچمە سەر کار، ئەوەشیان بۆ من کارەسات بوو، ئەگەر من ئازایانە خوێندنەکەم تەواو کردبووایە ئەوە بە ئاسانی کارم بۆ خۆم دەدۆزییەوە، بەوەش من سەربەخۆییەکەم بەدەست دەهێنا و زۆر منەتم بە میریل و برباره نەدەبوو.

لەگەڵ ئودری لە دەرەوە بووین کە گەڕاینەوە ماڵەوە میریل لەگەڵ باربرە لە نهۆمی سەرەوە دانیشتبوون و قاوەیان دەخواردەوە، ئەو کە منی بینی سڵاوی گەرمی لە من کرد و وتی:

من لە بەیانییەوە لە تۆ دەپرسم، ئەوە لە کوێ بوویت؟

کە ئەو قسەی لەگەڵ من کرد، هەستم دەکرد باربرە ئاخی دەکێشا و لە ئاکارییەوە دیاربوو کەوا زۆر نارەحەت دەبێت ئەگەر ببینێت مێردەکەی لەگەڵ مندا رووی خۆشە و بێجگە لە خۆی ژنێکی تری مەبەست بێت، ژنەکە مێردەکەی تەنیا بۆ خۆی دەویست. منیش وەڵامم دایەوە کە لەگەڵ ئودری پیاسەیەکمان بە پاسکیل کرد، کەمێک بەدیار شەپۆلەکانی رووبارەوە وەستابووین، سەری بادا و تێگەیشتنی دەنواند. من ماوەی یەک هەفتەبوو دەمویست لەسەر خوێندنەکەم قسەی لەگەڵدا بکەم، لە بوارێکی ساز دەگەڕام تا ئەو مەسەلەیەی لەگەڵ ببڕێنمەوە، ئێوارەی یەکشەمەیەک بوارەکە ساز بوو، شەوەکەی هاتە ژوورەکەی من، وتی من ئەمشەو لەگەڵ تۆدا دەبم.

ئەو شەوە من بە مێردەکەم وت زانکۆی یوتا کۆرسێکی خوێندنی هەیە و من دەمەوێ بچمە ئەو کۆرسە و لەو ماوەیەشدا لەگەڵ باوکم دەمینێمەوە، دیارە کەوا میریل ئەو بیرۆکەی پێ خۆش نەبوو، بۆیەش لە وەڵامی پێشنیازەکەی مندا وتی:

جارێ من هێشتا تۆم باش نەناسیوە و ئەوەندە بەیەکەوە نەبووین پەلەت چییە. بەڵام لە راستییدا ئەو بڕوای بەوە نەبوو من بچمەوە بەر خوێندن،

بۆیەش من تووشی شۆک هاتم، ئەو لە ئاکارمدا هەستی بەو نارەزاییە کرد، ئەو شەوەی کە لەگەڵ مندا نووستبوو، وتی ئەو شەوەمان هیچ تامی نەبوو، من هیچ خۆشییەکم وەرنەگرت. بڕیار بوو بەیانییەکەی میریل بچێتە شاری بیچ، بەڵام لە ناکاو بەرنامەکە گۆڕا، دیارە باربرە ویستبووی مێردەکەمان لە ماڵەوە بێت و دوور نەکەوێتەوە، بەوەیان غیرەی هەبوو، ئەوەشیان بۆ من باش بوو، ئەویش لە ناکاو بە منی وت، دەزانم بیرۆکەی خوێندنەکەت باشە و زۆریشم پێ خۆشە، بۆیەش پارەی ساڵانەی خوێندنەکەی لە پێش دانام و وتی دەتوانیت بچیتە کۆرسەکەت.

میریل لە کۆتاییی هەفتە گەڕایەوە ماڵەوە و کیژەکانی لە نووسینگەکەی خۆی کۆ دەکاتەوە و پێیان دەڵێت من ترسم هەیە ئەو ژنەم بەتەنیا بچێتەوە بەرخوێندن، بۆیەش زۆر لە کیژەکانی ئەو ئامادەییان دەربڕیبوو تا من کێشەکەم حەل بێت لەگەڵ مندا هاوڕێ بن، بەوەش هیچ کێشەیەکمان ناهێتە پێش. بۆ بەیانییەکەی لە ئودریم بیست کەوا ئەو بەرنامەیە دەستی کیژەکانی ئەوی تێدایە، ئەوان منیان هان داوە تا بخوێنم بەو فێڵە ئەوانیش بگەنە کولێج و بخوێن، من بەو قسەیە تووڕە بووم، چونکە من بە هیچ جۆرێک ئەوەم لە بیردا نەبووە و بیرم لەم جۆرە مەسەلەی نەکردووەتەوە، ئودرییش وتی ئێمە و هەموو خوشکەکانم هەرگیز کاری جاسووسیمان لەسەر تۆ نەکردووە و بەرنامەی لەو جۆرەمان نەبووە، بەڵام حەز دەکەین بخوێنین و بچینە زانکۆ، ئودری لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێت و لەلای من وتی:

ئێمە حەزمان کردووە بچینە کۆلێج، بەڵام باوکمان بەوەیان رازی نەبوو، بەڵام دیارە ئێستا بواری هەندێکمان دەدات بخوێنین و بچینە دەرەوە، ئێمە هەرگیز نەماندەزانی رۆژێک باوکمان قسەیەکی وا بکات، رەنگە ئۆتۆمۆبێلێک بۆ تۆش بکرێت.

## بووکێکی بێ بەخت

لە کیژەکە زانیم کەوا باوکیان رازی بووە من لە کۆرسە هاوینیەکەدا خۆم ناونووس بکەم، بەوەیان زۆر دڵم خۆش بوو، بەڵام دڵخۆشییەکەم شاردەوە، چونکە زۆریش بە قسەکە بڕوام نەدەکرد، تێگەیشتم چەندی درۆیە و چەندی راستی لەو قسەیەدا هەیە، ئێوارە کە میریل هاتەوە، ئەو منی بانگی ژوورەکەی باربرە کرد، لەوێ پێی وتم کەوا بڕیارم داوە ئۆتۆمۆبێلێکت بۆ بکڕم و لە کۆرسە هاوینەکەش بەشداربیت. بەو هەواڵە بزەیەکم هاتی، ویستم وا تێ نەگەن کەوا من زۆر کامەرانم، چونکە لەو دەمانەدا ئەو ژنانەی ناو تایفەکەمان ئۆتۆمۆبێلیان هەبوو ژمارەیان کەم بوو، زۆر کەمیش هەبوون بتوانن لە دەرەوەی خێزانەکەیان بژین، لە ژیاندا سەربەخۆییان هەبێت. میریل وتی:

تا خوێندنەکەت بکەیت، من لە نزیک کۆلیجەکەت شوقەیەکت بۆ دەدۆزمەوە، شوقەیەک بێت بەشی ژیانی تۆ و دوو لە کیژەکانم بکات، بەوەش بوارتان ساز دەبێت خوێندنەکەت بەردەوام بکەن.

بەیەکەوە چووینە شار و مێردەکەم دوو ئۆتۆمۆبێلی کڕی، یەکێکیان بۆ من و ئەوەی تریشیان بۆ نانسی کیژی ئەوەی لە شاری بیچ کاری دەکرد، هەفتەیەک مابوو بۆ دەستپێکردنی خوێندنەکەمان، ئەو هەفتەیە لەماڵەوە بووین.

شەوێکیان من لە شیرینە خەودا بووم ئودری منی بەئاگا هێنا و کە سەیرم کرد، بینیم لە ترسانا دەلەرزی، ئەو وتی:

ئیدارەی مامە روی فەرمانی بەشوودانی منی دەرکردووە، باوکم بۆ ئەو مەبەستە منی ویستووە و قسەی لەگەڵ کردووم. منیش چاوم هەر بە خەوەوە بوو و پرسیم دەزانی پیاوەکە کێیە. ئەو بەستەزمانانە وتی:

نازانم پیاوەکە کێیە و ناوی چییە و لە کێندەرێیە بەڵام ئەوە دەزانم کەوا ئەو بە تەمەن لە من گەورەترە، منیش ئەوم خۆش ناوێت، چونکە یەکێکی ترم هەڵبژاردووە و دڵم لەلای ئەودایە.

نەمدەزانی بە چ شێوەیەک دڵی کیژە داماوەکە بدەمەوە، چونکە کیژەکانمان هیچ بڕیاریان بەدەست نییە، بۆیان نییە هاوسەری خۆیان بەدڵی خۆیان هەڵبژێرن، ئەوەی دەمێنێتەوە دوا بڕیارەکەی مامە روییە، هەر ئەو بڕیار دەدات، ئەگەر کیژەکە بچێتە خزمەتی ئەویش و قسەی دڵی خۆشی بۆ بکات، هیچ لە بڕیارەکە ناگۆڕێت، پرۆسەی هاوسەرگیری فەرمانێکی ئاسمانییە و پێغەمبەرەکەی تایفەکەمان فەرمان دەدات و ئەو دوا بڕیارەکانی بۆ هاوسەرە بەختیارەکانی پرۆسەی هاوسەرگیری رادەگەیەنێت. ئەگەر ئودری شوو بە کوڕێک بکات لە دەرەوەی تایفەکەیان ئەوە شوورەیی و نارەحەتی بۆ خۆی و بۆ خێزانەکەی دروست دەکات. ژنانی تایفەکەمان دەتوانن پێغەمبەرەکەمان ببینن، بەڵام نەک بەتەنیایی، دەبێت ئەو دیدارە پیرۆزە لەگەڵ مێرد و منداڵەکانی ژنەکەوە بێت، باوکی ئودری رەزامەندی نیشان دابوو کەوا لەگەڵ ئەو بچینە خزمەتی پێغەمبەرەکەمان تا کیژەکە قسەی دڵی خۆی بکات، بەڵام بۆ جێبەجێکردنی داوای کیژەکە باوکی ئەو دەست و ئەو دەستی پێ دەکرد و کاتەکەی بۆ دیار نەدەکرد و سەردانەکەش هەر نەبوو.

هەموو گاڤێ ئودری ئەو قسەیەی دووبارە دەکردەوە و دەیوت:

من هەست دەکەم ژیانم تەواو، هیوادارم بوار ببێت دیمانەی پێغەمبەرەکەمان بکەم، تا بەوردی بابەتەکەی خۆمی بۆ شرۆڤە بکەم. ئەوەی مەسەلەکەی ئەو کیژەی ئاڵۆز کردبوو ئەو پیاوەی ئودری خۆشی دەویست، پیاوەکە ژنی تری هەبوو، پێغەمبەرەکەشمان فەرمانی دابوو ئەو شوو بە یەکێکی تر بکات، نەک ئەو پیاوەی ئەو خۆشی دەوێت.

پاش یەک دوو رۆژ مێردە چاوەڕوانەکەی ئودری هاتە سەردانی ماڵەکەمان، بەیەکەوە پیاسەیەکی کورتیان کرد، کە گەڕانەوە لە پیاسەکە ئەو دەگریا، دەیوت من هەست دەکەم هەموو داهاتووم و پرۆژەکانی دوارۆژم سووتا، پاش چەند رۆژێک ئودری دەستی لە خوێندنی کۆلێجەکەی بەردا و گەڕایەوە ماڵەوە و هەفتەیەک دواتر بووکیان گواستەوە، بەڵام من ئامادەی زەماوەندەکە نەبووم، لە وێنەکانی زەماوەندەکەوە دیاربوو کەوا میرلین و باربرەی ژنی بەو بۆنەیە

دڵشــاد نـەبوون، رووبان خــۆش دەرنەكــەوتبــوو، دیارە من دوایی وێنەكــانم بینیبوو. ئەو بۆنە كۆمەلآیەتییانە بۆ خەڵك بۆنەی شادومانی خەڵكەكەمان بوو، بەلآم ئەوانەی لەو ئاهەنگەدا دڵشــاد و كامـەران نەبوون تـەنیا ژن و مێـردەكە بوون، لـەو ئاهەنـگەدا بووك و زاوا بـە هیـچ شـێــوەیەك دڵیــان خــۆش نـەبوو، بەتایبـەتـی بووكـەكـە، كیـژەكە ویستـبـووی ئاهـەنگەكە هەڵوەشـێـنێـتـەوە، بەلآم پیـاوەكە حـەزی كردبوو ئاهەنگەكـە بكات، لە كـۆتاییـدا بڕیارەكـەی پیاوەكـە سـەردەكـەوێت، بۆیـەش وەك ئاهەنگە ئاسـاییـیـەكانی كـۆمـەڵەكـەمــان ئەو ئاهەنگەش بەڕێوەچوو.

## ژنە جاسووسەكە

ئۆدری بە رەفتارێكی ناشـیرین لەگەڵ مێردەكەی دەجوولآیەوە، لە ناو خەڵكەكە قسـەی وا بلآو كرایەوە كەوا ئۆدری پیاوێكی تری خۆش دەوێت و لەگەڵ ئەودا پێوەندیی هـەیە، دیارە كەوا ژنەكەش ئەوەی نەدەشـاردەوە، بـەلآم خـێـزانەكـەی ئەوەیان بەشـەرمـەزاری دەزانـی، بۆیەش باوكی دەچێتە لای كیژە بووكەكـەی و هوشـیـاری دەكاتەوە كـەوا كـار بۆ ئەوە بكات ئەوە قسـانەی لەسـەر نەمـێنێت، ناكرێ لە ناو خەڵكەكە دەهۆڵی بۆ لێ بدەن.

ئۆردی بە منی وت:

تا چی تر خەڵكەكە قسەم لەسـەر نەكەن، وا چاكە لەو پیاوە ئاوس بم، من بە منداڵبوون پرۆپاگەندەكانم لەسەر نامێنێت، بەوەش دەتوانم لە مێردەكەم نزیك بكەومـەوە و دڵمـان بـە ژیان خـۆش بێت، پێوەندییـەكـانمان دڵسـۆزانە و گـەرم بێت. بەلآم ئەگـەر من لە مـیریل ئاوس بوومـایە، ئەوا ژیانم لەگەڵ ئەودا دەبووە پێوەندییەكی ئەبەدی.

چەند هـەفـتـەیەك پاش سـكبـوونی ژنەكـە، مـیـردەكـەی لە شـوێـنێكی دوور كـارێكی دەسـتـكەوت، بۆیەش ئۆدری بیـرۆكـەی ئەوەی بۆ هـات كـەوا ئەویش لە هەمـان كۆلیـجەكـەی من خۆی ناونووس بـكات، ئەو سەرەتا پرسی بە من كرد،

منیش لایەنگیری ئەوم گرت و زۆریش هانی ئەوەم دا بخوێنێت، چونکە ئەویان زۆر هاورێم بوو، من ئەوم خۆش دەویست، هاتنی ئەو خوشکە جاسووسەکەی (لینور)ی لە کۆڵ دەکردمەوە، چونکە ئەو بەردەوام جاسووسی لەسەر دەکرد، مێردەکەشی بیرۆکەکەی لا باش بوو، بەڵام باوکی بەو بڕیارەی کیژەکەی دڵی خۆش نەبوو. ئەو خوشکەیان لینور زۆر دژایەتی منی دەکرد، کۆششی دەکرد نێوان من و ئودری خوشکی تێک بدات، دەیویست من لەگەڵ مێردەکەم و خێزانەکەمان نێوانمان خراپ بێت. میردەکەم لە کۆتاییی هەفتەکان لەماڵەوە دەهاتە لام، هەروەها رۆژانی دووشەموانیش کە من لە کۆلێج بووم دەهاتە لام، ئەودەمانە ئەو دەهاتە کە (لینور)ی کیژی لە دەوامی کۆلێج بووایە، بەیەکەوە سێکسمان دەکرد و دەچووینە رێستورانتێکی نزیک خۆمان نانێکمان دەخوارد و ئەو دەرۆیشتەوە سەر کارەکانی خۆیەوە. کۆششەکانی لینور بۆ ئاڵۆزی من و خوشکەکەی سەری نەدەگرت، بۆیە دەیویست بە هەر شێوەیەک بێت من توورە بکات، دەهات و خێرا خۆی دەکردە ژوورەکەی من و دەستی لە کەلوپەلەکانم وەردەدا، دەستدرێژی دەکردە سەر کایە تایبەتییەکانم، ملی لە من دەهێنایە پێشەوە، ئەو تەنیا مەبەستی ئەوە بوو من توورە و هەراسان بکات، منیش تاکە کاردانەوەم لە بەرامبەر ئەو کارە قێزەوەنانە لەلای باوکی ئەو کە دەکاتە مێردی من گلەییم دەکرد، دوا جار بە مێردەکەم وت:

ئەگەر ئەو کیژە دەستبەرداری ئەو کردەوانە نەبێت، ئەوا من ناچارم لێرە و لەو شوقەیە بار بکەم، ناکرێ بەو جۆرە لەگەڵ ئەودا بژیم، تاقەتم نەما، من دەمەوێ بخوێنم و بژیم، ژیان و خوێندنیش لەو رەوشەدا ناکرێت؟

لە وەڵامی ئەو داوایەم میریلی هاوسەرم وتی:

ئەوەی من دەمەوێ تەنیا دەبێ ئەوانە بکەیت، ئەگەر فەرمانەکانی منت جێبەجێ کرد ئەوا لەگەڵ هیچ لە ئەندامەکانی خێزانەکەم کێشەت نابێت، تۆ تەنیا من رازی بکە، هەموو شتەکان وەک ئاو بە جوانی بەرێوە دەڕوات.

لەو رۆژەوە من دەرگەی ژووری نووستنەکەم لەسەر خۆم دادەخست، بەوەش کیژەکە زۆرتر هار دەبوو، بۆیەش میریل گلەیی هەبوو منیش لە وەڵامدا وتم:

من دەبێ ڕەوشی تایبەتی خۆم هەبێت، دەبێ مەسەلە تایبەتییەکانم پارێزراو بێت. ئەو لە وەڵامدا وتی:

هیچ کەسێک لەو خێزانەدا مافی ئەوەی نییە، شتەکان لە من بشارێتەوە، من دەبێ هەموو تایبەتییەکانی هەمووتان بزانم.

## ژنێکی بەدفەڕ

هەفتەیەک لە پاش ئەو کێشەیە ڕۆژێکیان لە دەوام گەڕامەوە بینیم چەند شتێکی تایبەتیم دیار نەماوە، دەستکاری ژوورەکەم کراوە، منیش بەناچاری پێوەندییم بە مێردەکەم کردو پێم وت، ئەو کیژەی تۆ بڕێک لە شتەکانی منی بردووە و زۆریش بەو کارەی تووڕەم، ئەو لە وەڵامدا وتی:

ژنەکە باش بزانە هەموو شتەکانی تۆ و هەموو شتەکانی ئەو ماڵە، موڵکی منە، هەموو دەمێک دەتوانم دەستیان بەسەردا بگرم، من دەسەڵاتی تەواوم بەسەر هەموو شتەکان و کەسەکانی ئەو خێزانەدا هەیە.

ئەوەی گوێم لێ بوو تووشی شۆکی کردم، چۆن مێردەکەم حەق بە کیژەکانی دەدات کەلوپەلی من بپشکنن، بۆیە من چوومەوە ماڵی باوکم کۆتاییی هەفتەکە لەوێ مامەوە، بۆ نووستن هاتمەوە ماڵی میریل، ئەو داوای لێ کردم هەموومان بەیەکەوە بچینە کڵێسە، بەڵام من لەگەڵیان نەچووم، من زووتر گەڕامەوە کۆلێج، مێردەکەم تەلەفۆنی کرد و گلەیی لێ کردم، منیش وتم بۆیە لەگەڵتان نەهاتم بۆ کڵێسە، چونکە خوێندنم هەبوو، نەدەکرا زۆرتر بمێنێمەوە و لەو ڕۆژانەش کاتی تاقیکردنەوەکانمە. لەو ڕۆژەوە تا لە ماڵەوە دوور بکەومەوە و زۆرتر لە ناو ماڵەکەی میریل نەمینێمەوە ئێوارەی یەکشەممۆان زووتر دەگەڕامەوە کۆلێجەکەمان. من لە ڕۆژانی شەممۆان لە ماڵپاککردنەوەی ماڵەوە و چێشت سازکردنی کۆتاییی هەفتە بەشداریم نەدەکرد، لە ژووری نووستنەکەی خۆمدا دەرگەم لەسەر خۆم دادەخست، بەوەش پاڵەپەستۆم لەسەر سووکتر دەبوو، ئەوانە هەمووش بیانوو بوون تا هەوێیەکەم بە میریل

بڵێت کەوا من ژنێکی بێکەڵکم و بەکەڵک ماڵ و مێرد ناهێم، من ژنێکی بەدفەرم، بۆیەش مێردەکەم وەک جاران شەوانی شەموان و یەکشەموان لەگەڵ مندا نەدەمایەوە و بەرنامەکەی تێک دابوو، هەمووش لە ئاکامی شکایەت و گلەیییەکانی باربرەی هەوێیەکەم بوو. کە باربرە دەخەوت، نیوەی شەوان دەهاتە لام و سێکسی دەکرد و دەردەچوو، بەخێرایی دەگەڕایەوە سەر جێگەکەی باربرە، تا وا نیشان بدات، ئەو شەوە نەهاتووەتە گژ من و سێکسی لەگەڵ مندا نەکردووە، چونکە دەرچوونەکانی لە ژووری نووستنی ئەو ماوەیەکی کورت بوو، بۆیە بیانووی نەدەدا کەوا ئەو سێکسی لەگەڵ مندا کردبێت، پاڵەپەستۆ و توندکارییەکانی سەر من بەردەوام بوو، هەموو ئەندامەکانی خێزانەکەم دەستیان لە بەدکاری لەسەر من زۆر و گەرم کردبوو.

پاش تێپەڕبوونی چوار مانگ بەسەر زەماوەندەکەمان لەوە تێگەیشتم کەوا خوێندنەکەم باشترین بوارە بۆ ئەوەی من لە خێزانەکەی میریل خۆم دوور رابگرم و لەو ماڵە مێردە دوور بم کە بێجگە لە من، ئەو سێ ژنی تریشی هەبوو. لە کاتی پشوودانی هاوینەدا من گەڕامەوە ماڵی باوکم رۆژێکیان برا و خوشکە گچکەکانم بە ئۆتۆمۆبێل دەبردە سەیران، لە رێگە تووشی کارەساتێک هاتین و لە ئەنجامدا نوریلونی خوشکم گیانی لەدەستدا. پاش یازدە مانگیش لە شووکردنەکەشم من ئاوس بووم، لە ماوەی مانگەکانی ئاوسبوونەکەمدا زۆر نارەحەت بووم، رەوشم زۆر ئاڵۆز بوو، کە شووکردنەکەم ژیانی تێک دابووم، ئەوە سکبوونەکەشم تەندروستیشی تێک دام، چەندین کێشەی نوێم لەگەڵ خێزانەکەی میریل دەهاتە پێش.

حیکمەتی باوی ناو تایفەکەمان ئەوەبوو، ئەگەر کەسێک کێشە و گرفتی زۆری بێتە پێش، ئەوە دەرئەنجامی ئەوەیە ئەو کەسە زووتر هەڵەی کردووە و ئەو کێشانە وەک سزایە دێتەوە پێشیان، بەڵام نەخۆشییە جەستەییەکان و دەروونییەکانیش ئەوە لەعنەتی خوایە رووبەڕوویان دەبێتەوە، ژنی ئاوس نەدەبووایە باس لە ژانی سکەکەی بکات، گلەیی بکات و بناڵێنێتەوە، بەڵام دەکرا پرسیار لە رەوش و تەندروستی خۆی و سکەکەی بکرێت و بەس، نەک

خۆت باس لە ئازارەکانی رۆژانەی ئاوسبوونەکەت بکەیت، ئەو ژنانەی زۆرترین منداڵیان دەبێت، نەک لەلایەن پیاوەکانیان و کۆمەڵگەکەیان پیرۆز دەبن، بگرە ئەو ژنانە خـوا رەزای پیـرۆزیان بۆ رەوانە دەکـات، زۆریش ئاسـایی بوو ژنەکانمان ١٢ تا ١٦ منداڵی ببێت.

لە ناو خێزانەکەماندا هەوێیەکانم منیان بە دوژمنی گەورەی خۆیان دەزانی، ئەوان منیـان بەوە دەزانی کەوا بەردەوام لە فەرمـانەکانی مێردەکـەم یاخیم، کـێشـەی زۆر دەنێـمـەوە، رادەسـتـی ئەو و ئارەزووەکـانی نابم، بۆیەش وایان دەزانی کـەوا مـن مـوسـتـەحـەقی ئەوەم زۆرترین و گـەورەترین ئازار بدرێم و بەردەوام نارەحـەتم بکەن. ئەگـەرچی کۆمـەڵەکـەمـان سرووتی ئوسـولی زۆری هەبوو، ئەوانیش رەوشی سـێکسکردنیـان بە هـێـز و بە دەسـەڵات و چینە کۆمـەڵایەتییەوە دەبەستەوە، ئەو ژنەی نەیەوێت بە ئارەزووی پیاوەکەی سێکس بکات، بە ژنێکی یاخی و سـەرکـێشـیـان دەزانی، ئەگـەر پیـاوەکـە یەکـێک لە ژنەکـانـی تری لەسـەر ئەوانی تری پایەدار کـردبووایە، ئەوەو ژنەکـانـی تر غـیـرەیان لەو دەکـرد و شـەڕیان دەکـرد، ئەویش خـۆی لەوانی تر و بەهـێـزتر دەزانی وەک کـەسێکی پایەدار خـۆی دەنواند، تا رادەیەک غیـرەکـردنی ژنێک لەوانی تر، پێوانەی ویستی مێردەکە و ئارەزووەکانی ئەوی دەگەیاند.

لە مـانـگی دیسـەمـبـەری سـاڵی ١٩٨٧ ئارسـەری کـوڕم لە دایک بوو، پاش بوونی ئەو کوڕەم ژیانم گۆڕا، هـەسـتـم دەکرد کـەسـێکی ترم و جـێگە و پلەم بەرزترە، بەهـۆی ئەو منداڵەوە کـەوتمە نـاو جـیـهـانێکی تر و چی تر هـەسـتـم بەتەنیـایی و نامـۆیی نەدەکرد، بەو کوڕە بـاش سـەرقـاڵ و مـورتـاح بووم. پاش سێ مـانگ شەوێکیـان میریلی مێردم ویستی سـێکسم لەگەڵدا بکات، کە داوای لێ کردم، زۆر ترسام، چونکە من نەمدەتوانی بەرگەی سکێکی تر بگرم، ئەگەر سێکسم لەگەڵ مێردەکەشم نەکردبووایە و تەسلیمی داواکەی ئەو نەبوومـایە، ئەوا ئەویش مـەسـرەف و پارەی لەسـەر دەبڕیم، ئەو بە پـارەکـانیـیـەوە دەسـەڵاتەکـەی دەچەسـپـاند و دەسـتی دەڕۆیشـت، نەک مـێردەکـەی من وابوو، هەمـوو پیـاوەکانی نـاو تـایفەکـەمـان وابوون، دەسـەڵاتەکانیان بە پارەکانیانەوە

بوو، ئەگەر ژنەکانیش کاریان کردبووایە و مووچەی [illegible] وەرگرتبووایە، ئەوە دەبوو پارەکەیان لە دەستی مێردەکانیان [illegible] ئەوانەی پارەی یارمەتی کۆمەڵایەتییان وەردەگرت، دەبووایە [illegible] پارەیەش بدەنە مێردەکانیان.

## هەسارەیەکی تر

میریل کەسێکی دەوڵەمەندبوو، من دەمزانی ئەو پارەیەکی ئەستووری هەیە، ئەوەش مانای ئەوە نەبوو کەوا ئێمە خواردنمان زۆرە و بەردەوام خواردەمەنی و پێویستییەکانمان بۆ دەکێشێتەوە، ئەو هەفتانە تەنیا پێنج سەد دۆلاری بۆ مەسرەفی خێزانێکی سێ کەسی دانابوو، بەڵام زۆربەی شەوانەش ئەو لەگەڵ ژنە نازدارەکەی باربرە لە دەرەوە و لە رێستورانتە نایابەکان بەیەکەوە نانیان دەخوارد، ئێمەش نەدەبوو یاخی بین، یان گلەیی لە بەدخۆراکی بکەین. لە ماڵی باوکیشم هەمان بەرنامە بۆ پارە سەرفکردن پەیڕەو دەکرا، کە من لە ماڵەوە و لەلای باوکم گلەییم لە مێردەکەم دەکرد، ئەوان ئامادەییان تێدا نەبوو گوێ لەو گلەییانە بگرن، قسەکانی منیان بە رەوا نەدەزانی، ئەوان لایەنگیری مێردەکەی منیان دەگرت، چونکە بەپێی نەریت و سرووتەکانی ئەو تایفەیە پیاو هەموو حەقی رەهای هەیە لەسەر کۆنترۆڵکردنی ماڵ و خێزانەکەی، ئەوەی ئەو دەیکات هەمووی راستە و قابیلی تانە و بیانوو نییە.

لەبەر پرسیار و تانەی خوێندکارەکانی زانکۆ حەزم نەدەکرد چی تر سکم ببێت، لە قسەکانی ئەوان ترسابووم، بۆیەش بەردەوام بەتەنیا دەمامەوە، کەسیش لەوان حەزی نەدەکرد بێتە تەنیشتمەوە، ئەوان بە چاوی ئەوە سەیری منیان دەکرد، کە من لە هەسارەیەکی ترەوە هاتووم، من کەسێکی نامۆم و ئادەمیزادێکی سەدە کۆنەکانم.

کوڕەکەم تەمەنی گەیشتە حەوت مانگ، سکبوونم بەبۆچوونی مێردەکەم درەنگی بەسەردا هات، دەبووایە من ئێستا دووبارە ئاوس ببمەوە، ناکرێ

سکم نەبێت، بۆیەش ئەو پاڵەپەستۆکانی توندتر و زۆرتر دەکرد، منیش لە ئاوسبوون ماندوو بووبووم، لەوەش دەترسام، بەڵام ژنەکانی تری ناو کۆمەڵەکەمان پاش سێ مانگ لە منداڵ بوونەکەیان دووبارە سکیان دەبووەوە و ئاوس دەبوون، ئەوەش بەرنامە و سرووتەکانی کۆمەڵە و خەڵکەکەبوون.

لە مانگی یولیۆدا لە زانکۆ دەرچووم، خوێندنم تەواو کرد، (بیتی) کیژم لە دایک بوو، ئەو لەگەڵ ئارسەری برای بەیەکەوە دوورگەیەکی ئەڤینیان بۆ من لە ناو ئەو خێزانە تەژی لە خەم و کێشە و نایەکسانییەکان رەخساند و دڵم بەو دوورگەیە زۆر خۆش بوو، ئەو دەمانەش من تەمەنم تەنیا بیست و دوو ساڵ بوو.

ئەگەرچی مێردەکەم پیاوێکی زۆر شۆخ و جوان بوو، بەڵام هەرگیز بڕوام نەدەکرد ئەو پیاوە مێردی منە و دڵم بۆی لێ نەدەدا، ئەو پیاوە ئەو کەسەیە ژیان و جەستەمی داگیر کردووە، ئەو بۆ من داگیرکەرێک بوو و بەس، بۆیەش بیرم لەوە دەکردەوە سەرچاوەیەکی دارایی و پارە پەیداکردن بۆ خۆم ساز بکەم و کارم بەو نەمینێت، چونکە ئەو بە پێوانەکانی کۆمەڵەکەشمان (FLDS) لەگەڵ ژنەکانی تەندروست و بەحەقانە نەدەجولایەوە، ئەگەرچی لە ناو کۆمەڵەکەشماندا جێگە و پێگەیەکی باڵاشی هەبوو.

پاش چەند مانگێک گەیشتینە رەوشێکی گوزەران خراپ، هەموو کەلوپەلەکانمان تەواو دەبوون، خواردەمەنییەکانم نەمابوو، بەتایبەتی زستانەکەی رەوشمان خراپ بوو، باخچەکەشمان بەستبووی، هەستمان بە نارەحەتی دەکرد و میریلیش دەستەوەستان بوو، هیچی نەدەکرد. ئەو لەگەڵ باربرەی ژنی لە شاری بیچ کامەران و گوزەران خۆش دەژیان، لە شوێنی باش و گران نەبووایە نانیان نەدەخوارد، ژنەکە ئەوەندە خۆپەرست بوو تەنیا ژیانی خۆشی بۆ خۆی دەویست، باشیشی دەزانی ئێمە لە ماڵەوە هیچمان نییە بیخۆین، ئەویش لەگەڵ مێردەکەی شاهانە رایان دەبوارد.

## پێشەنگێکی بەدفەڕ

لە ماڵەوە هیچمان نەما بیخۆین، میریل هەر شەش ژنەکەی بانگی نووسینگەکەی کردبوو، لەوێ مەرسوومێکی بۆ هەموان راکەیاند، کە تێدا وتی:

لەو ماڵە دەسەڵاتی هەموو شتەکان بەدەست باربرە، ئەو سیاسەتی خێزانەکە دەکێشێت، ئەو کارەکانی لە ناو ئەندامەکانی خێزانەکەمان دابەش دەکات. منیش پرسیم ئەگەر ئەو هەموو کار و فەرمانەکانی لەبن دەست دابێت و کەمیش لە ماڵەوە بێت، ئێمە لەو حاڵەتەدا چ بکەین، دەبێ چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەو بکەین، چونکە هەمووومان ئەوە باش دەزانن ئەو زۆرتر لە دەرەوەیە! مێردەکەم بە پرسیارەکەی من تووڕە بوو. لەو دانیشتنەدا تەنیا من دەمم کردەوە و هیچ لە ژنەکانی تری مێردەکەم قسەیەکیان نەکرد، رەخنە و رامانیان نەبوو.

من بە میریلم وت:

کەی رەوایە تۆ لەگەڵ باربرە بەردەوام لە رێستورانتە پلە بەرزەکاندا نان دەخۆن، ئێمەش لەگەڵ منداڵەکان خواردنی باشمان سەندویشی تەماتەیە؟ بەو قسەیەی من زۆر تووڕە بوو. ئەو بە تووڕەییەوە وتی:

دیارە تۆ سەندویش بە خواردنێکی خراپە دەزانیت؟

منیش وەڵامم دایەوە و وتم:

ئەگەر سەندویش خواردنێکی واباشە بۆچی خۆت و باربرە لەگەڵ ئێمە ئەو خواردنە ناخۆن، وەرن لەگەڵ ئێمە سەندویشی تەماتە بخۆن. کە ژنەکانی تر ئەو قسە رەقانەی منیان گوێ لێ بوو، ئەوانیش دەمیان کرایەوە و لەسەر یاخیبوون راهاتن، وای لێ هات بەئاشکرا باسی رۆژە رەشەکانی خۆیان دەکرد، باسی برسیبوونی خۆیان و منداڵەکانیان دەکرد، دەنگیان بەرز دەکردەوە و گلەییان هەبوو، بۆیەش میریل و باربرە زۆر تووڕە بوون، بەڵام

ژنەکە قسەی نەدەکرد، بواری مێردەکەی دا وەڵامەکان بداتەوە. هەموومان بە پیاوەکەمان وت، ئەو ژنە پێشەنگێکی بەدفەڕە و رەوشمان لەگەڵ ئەودا زۆر جیاوازەو ناکرێ ئەو بە چاوێکی تر سەیری بکرێت، ئێمەش لەگەڵ منداڵەکانمان بە چاوێکی تری جیاواز سەیر بکرێن، ئەو هەرگیز پێشەنگی ژنەکانی تۆ نییە. ژنەکە کە زانی لە هەموولایەک ژنەکان سەرکۆنەی دەکەن، کە تێگەیشت کەس لە رفتارەکانی رازی نییە دەستی بە گریان کرد و لە شوێنەکە دەرچوو، بۆیەش مێردەکەمان لای ئەوی دەگرت و لەوە ئاگەداری کردینەوە کەوا ناکرێ ئەو ژنە بێزار و هەراسان بکەن.

کە ئەو پرسیاری ئەوەی کرد چیتان پێویستە، ئێمەش وتمان هەموومان پارەمان پێویستە، منداڵەکانمان پارەی مەسروفیان دەوێت، بۆیەش ئەو رازی بوو بڕێک پارەمان بۆ زیاد بکات، بەڵام وتی:

لە ئەنجامی ئەوەی باربرەتان عاجز کردووە، من تۆڵەتان لێ دەکەمەوە و سزاکەشم قورس دەبێت. بەڵام میریلی مێردمان هیچی نەکرد و کەسی لە ئێمە لەسەر باربرە سزا نەدا.

چەند کیژێکی باربرە تەمەنیان لە ساڵانی بیستەکان بوو، هیچیان شوویان نەکردبوو، دوایی زانیمان کەوا لە ناو کۆمەڵەکەمان لە شارەکانی کۆلۆرادو هیلدیل و سۆلت لیک و لە کەنداش زۆر لە کیژەکانیان شوویان نەکردووە و تەمەنیان بەرەو گەورەیی دەڕوات، ئەگەرچی پێغەمبەرەکەمان بۆ بەشوودانی ئەو کیژانە بەردەوام و ساڵانە مێرد و پیاوی بۆ دەدۆزینەوە، بەڵام هێشتا زۆریان شوویان نەدەکرد و مابوونەوە. باوکەکان لەوە دەترسان کیژەکانیان ببنە قەیرە و دوایی ناچاربن خۆیان مێرد بۆ خۆیان بدۆزنەوە و لە نەریتی کۆمەڵەکەیان دەرچن، بۆیەش پەنایان بردبووە بەر پێغەمبەرەکەیان تا کارێک بکات مێرد بۆ کیژەکانیان دەستنیشان بکات، چونکە تەمەنیان گەورەتر بێت دەمێنێنەوە و دوایی لە دەستیان دەردەچن، قسەی واش بڵاو دەکرایەوە کەوا باوکەکان وا بە دوای مێرد بۆ کیژەکانیان دەگەڕێن، ئەوەش مانای ئەوە بوو دەسەڵاتی پێغەمبەرەکەیان لاواز دەبێت و کارەکانی سەرشانی پێ ناکرێت.

## میریل وتی سەگ لە ژن بەوەفاترن

لە کۆتاییی ئاهەنگەکەدا میریل دەستی منی بەردا و لە ژوورەکە دەرچوو و ئاوڕی پشتەوەشی نەدایەوە، لە دوای ئەو خێزانەکەی دەرچوون، من لەودەمانە نەمدەزانی چ بکەم، من لە دوای باوکم بەرەو ژوورە گەورەکەی پێشوازی ڕۆیشتم، لەوێ ئاهەنگی لەدایکبوونێک ساز دەکرا. کە خێزانەکەی میریل هاتن خەڵکەکە تێگەیشتن زەماوەندێک هەیە، بۆیەش پیرۆزباییان بە میریل دەوتەوە. من لە رووەکەی تری ژوورەکە بە فستانی بووکینیەوە دانیشتم، ئاهەنگی لەدایکبوونی یەکێکیش لە ئامادەبووان بەردەوام بوو، بەگەرمی پیرۆزباییان لە مێردەکەم دەکرد. من لەو رۆژەوە تێگەیشتم من لەو خێزانەی خۆم بەیەکجاری دابڕاوم. خێزانەکەی میریل کە دەبووایە رووی تێ بەکەم وەک وڵاتێکی نامۆ بوو بۆ من، کە بە هیچ شێوەیەک مەیلی چوونە ناوەوەی ئەو وڵاتەم نەبوو، لەو رۆژەوە لە ناو هەموو دیاردەکانی کۆنەکانی پێشووم دەرچووم و دەریان هێنام.

لەو بۆنەیە یەکێک لە ژنەکانی مامە روی کە ژمارەیان دوازدە بوو لەوێ بوو، ئەو بە بزەیەکی پانەوە سەیری کردم و وتی:

خوا ئەو شووکردنەت بە میریل پیرۆز و موبارەک دەکات، دڵنیاشم زۆر لەگەڵ ئەو پیاوە کامەران دەبیت، ئەو منی بانگ کردە سەر خوانەکەی خۆی، تا بەیەکەوە پارچەیەک کێک بخۆین.

هەردوو ژنی میریل، باربرە و رۆس لەلای چەپ و راستی میریل راوەستابوون، کە من دەرکەوتم میریل فەرمانی بە رۆسی ژنی کرد جێگەی من بکاتەوە و خۆی جێگەیەک بۆ خۆی بدۆزێتەوە، من کە چوومە تەنیشت میریل، ژنەکە جێگەیەکی بەتاڵی دەستنەکەوت تێدا دابنیشێت بەناچاری لە ژوورەکە

دەرچووە دەرەوە، کە نانمان خوارد و خوانەکە کۆتایی هات، باوکم هەڵسایەوە بۆ ڕۆیشتن و من بەڕێ بکات، من بەدوای باوکم چوومە دەرەوە و سواری ئۆتۆمۆبێلەکەی ئەو بووم تا من بباتە هوتێلەکەمان، کە ژووری بووک و زاوای تێدا گیرابوو. پاش گاڤێکی کورت میریلی زاواش کەیشتە هوتێلەکە، لە دەرگەی ژوورەکەی ئێمەی دا، باوکم دەرگەکەی لەو کردەوە و هاتە ژوورەوە و لەگەڵ باوکم ئاخاوتنێکی کورتیان کرد و ئەو کەلوپەلەکانی منی کۆ کردەوە، منیش لەو دەمانە ئەوەندە دەترسام، ئەوەندە نارەحەت بووم دەمویست بە دەنگێکی بەرزەوە بە مێردەکەم بڵێم، من نامەوێ لەگەڵ تۆدا بێم، من تۆم بە هیچ شێوەیەک ناوێت.

## ونبوون

میریل لە ژوورەکەی باوکم بە منی وت:

کارۆلین ... دیارە ناخوازیت لەگەڵ مندا بێیت و هاوشانم بیت؟ دیارە کەوا کەلوپەلەکانیشت قورسن.

ئەو رستەیە یەکەمین قسەی بوو کە ئەو لەگەڵ مندا کردی، منیش بەدوای کەوتم، بە ڕەوشێکی ونبوو و سەرلێشێواو لە دوای دەرۆیشتم. ئەو ژمارەی ژوورەکەی ئێمەی لە ناو هوتێلەکە لە بیر کردبوو، دەچووە سەرەوە و دادەبەزی، منیش هەر بە دواوەی بووم.

پاش گەڕانێکی زۆر لە پێش دەرگەی ژوورێک وەستاین، کە میریلی بەتەنگاوی کلیلەکەی بەکار هێنا دەرگەکە کرایەوە، لە دۆزینەوەی ژوورەکەمان ئەو سەرکەوت، بەیەکەوە چووینە ژوورەوە، ئەو دەرگەکەی داخست، ئەوەشیان یەکەمین جاربوو من لەگەڵ ئەو بەیەکەوە و تەنیا بین، ئەو لەسەر سیسەمەکە دانیشت، تەلەڤزیۆنەکەی کردەوە، منیش لە گۆشەیەکی ژوورەکە لەسەر مێزێکی گچکە جێگەی خۆم کردەوە و دانیشتم، تا ئێستا یەک وشەش لە دەمم دەرنەچووبوو، بێدەنگ بووین، پاش بیست دەقە بەو شێوەیە بوو، پاشان ئەو

وتی، من دەچم سۆراخێکی ئەندامەکانی تری خێزانەکەم دەکەم، ئەو لە ژوورەکە دەرچوو.

منیش لە ژوورەکە تەنیا مامەوە، گەیشتمە سەر سیسەمەکە، هەستم کرد خەوم دێت، من دوو شەو بوو نەنووستبووم. کە میریل هاتەوە دیسان تەلەڤزیۆنەکەی پێ کردەوە و دەنگی بەرز کرد و وتی:

باشە ئەگەر کەمێک قسەمان بۆ بکەیت.

منیش وەڵامم دایەوە کەوا من ئێستا زۆر ماندووم، زۆر پێویستم بە کەمێک پشوودان هەیە، تا ئیسراحەت نەکەم هیچم بۆ ناگوترێت، ئەویش لە وەڵامدا وتی:

کەواتە باشە.

ئەو جلەکانی لەبەر کردەوە و تەنیا یەک پارچەی لەبەر خۆی هێشتەوە و هاتە تەنیشتم و سەیری دەکردم. ئەودەمانە کاتێکی ترسناک و زەحمەت بوون، من لە تەنیشت پیاوێک نووستوم هەرگیز زووتر نەمناسیوە.

میریل ویستی ماچم بکات، من بەوەیان زۆر ناڕەحەت بوو، بەڵام زۆرتر لە من نزیک دەکەوتەوە، ویستی فستانەکەم لەبەر بکاتەوە، من دەلەرزیم توانیم لەبن دەستی دەربازم بێت، چوومە سەر ئەرزەکە و لە تەنیشت سیسەمەکە دانیشتم و لە هەموو دەمێک زۆرتر هەستم دەکرد من ڕەوشم خراپە و زۆریش دەترسام. ئەو کە زانی من رادەستی ئەو نابم، جلەکانی لەبەر کردەوە و لەسەر تەنیشتی سیسەمەکە دانیشت، قسەی بۆ دەکردم دەیویست رووی خۆی شیرین بکات و بیانوو بۆ کارە ناڕەواکانی بدۆزێتەوە.

من کەوتمە قسەکردن لەگەڵ ئەودا و وتم:

من زۆر هیلاکم دەمەوێت بنووم. دیاربوو ئەو بە هیچ شێوەیەک بایەخی بە قسەکانی من نەدەدا، لەسەر سیسەمەکە پاڵکەوت و دەستی بە پرخە پرخ کرد، من کەڕامەوە سەر سیسەمەکە و ماوەیەک سەیری بنمیچی ژوورەکەم کرد و خەوم لێ کەوت.

که بەیانی من بەئاگا هاتم ئەو لە گەرماوەکە بوو، کە هاتەوە دەرەوە بەبێ قسەکردن خۆی گۆڕی و دەرچوو. کە ئەو لە ژوورەکە دەرچوو، منیش خۆم شووشت و جلەکانم لەبەر کرد، دەمویست بچمە ژوورەکەی باوکم، لە ئێمە کەمێک نزیک بوو، ئەو گەڕایەوە ژوورەوە و وتی:

لەگەڵم وەرە.

لەسەر داواکەی ئەو خۆم پێچایەوە و بەدوای کەوتم بۆ لای ئۆتۆمۆبێلەکەی ئەو ڕۆیشتین، بەڵام من زۆر دەترسام، لە شوێنێکی نزیک هوتێلەکەوە نانی بەیانیمان خوارد، لەوێ میریل منی بە هەندێ لە پیاوە ئامادەبووەکانی ناساندن، کەوا من ژنە نوێیەکەی ئەوم، ئەوانیش کامەران و دڵشادییان نیشان دا، یەکێکیان نوکتەیەکی گێڕایەوە کە تێیدا ژنی نوێی بە سەگ وەسف کرد، هەموویان بە نوکتەکە کەوتنە سەرپشت، بەڵام مێردەکەم وتی:

هێشتا سەگ لە ژنە نوێیەکان بەوەفاترن.

لە پاش ئەوەی ژنیان بە سەگ پێناسە کرد، میریل نوکتەیەکی تری بۆ ئامادەبووان گێڕایەوەو وتی:

ژنهێنان وەک ئەوەیە پیاو بچێتە گەرماو، بەڵام کە دەچێتە ژوورەوە دەبینی ئەوەندە گەرم نییە، وەک ئەوەی تۆ دەتەوێت. بەو نوکتەیەش هەموو کەوتنە سەرپشت، منیش هەستم دەکرد کەوا من هەرگیز بەو شێوەیە ئیهانە نەکراوم، زۆر دڵتەنگ بووم.

لە پاش ئەوەی نانی بەیانیمان خوارد، هەموومان لە دەرەوەی پارکی ئۆتۆمۆبێلەکان کۆبووینەوە، لەوێ باوکم لەگەڵ میریلی مێردم باسی مەزادێکیان دەکرد لە ئۆریگۆن. میریل ئەندامانی خێزانەکەی خۆی گەیاندەوە ماڵەوە، کەس باسی مانگی هەنگوینی منیان نەکرد، کەس پرسیارێکی لەسەر شەوی بەزاوابوونیان نەکرد. منیش لەگەڵ ئەو سواری ئۆتۆمۆبێلەکە بووین بەرەو ئۆریگۆن بەڕێ کەوتین، لەو ڕێگەیە من تەنیا بیرم لەلای تاقیکردنەوەی قوتابخانەکەم بوو، کە لەبەر ئەو بەشوودانە لە دەستم چوو بوو.

## سریالیەت

بەو سەفەرە لە ناکاوە مورتاح بووم، چونکە لە ناو ئۆتۆمۆبێلەکە باوکم و رۆزی هەوێم و شەریکە بازرگانەکەی لەگەڵمان دابوو، ئەوان دەچوونە موزایدەیەک کە دوو رۆژ بوو لە ئوریگۆن کرابووەوە، ئەوەش بوار ساز بوو من قسە لەگەڵ میریل نەکەم و ئەویش ئاگای لە من نەبێت، ئەو منی لە بەشێکی سەفقەیەک دەزانی، بەڵام سەبارەت بە من هەموو شتەکان گۆڕان و دنیام لێ سەروبن بووبوو. بەدرێژاییی رێگەکە من حاڵەتی شۆکی شەوی رابردووم لە مێشکدا بوو، ئەوەی بیرم لێ نەدەکردەوە سێکس بوو، نەمدەزانی وا بە وەحشیەت و رەقکاری دەبێت.

من وام دەزانی کەوا پیاو دەبێ بەرامبەر ژنەکەی کەسێکی هەستیار بێت، تا پرسی پێ نەکات دەستی بۆ نابات، من ئەوەندە سادە و نەفام بووم وام دەزانی ئەو شەوی بەزاوابوون لەگەڵمدا نەرم دەبێت، پرسم پێ دەکات، چونکە ئەو چاک دەزانێت من هیچ لەسەر سێکس نازانم، دەبێ ئەو شتەکانمان بۆ روون بکاتەوە، بەڵام ئەو گـــوێی بەوانە نەدەدا. باوکم و رۆزی ژنی بەو بەشـــوودانی من بەختـــیـــاربوون، بەڵام من وام دەزانی ئەو پرۆســـەیە زۆر سریالییە، ئەوان چۆن دڵیان بە شتێکی وا خۆشە، بەو ئەزموونە ناشیرین و سووکەی من دڵیان خۆشە؟

من ئەوەم باش دەزانی کە ماڵەوەمان دڵنیا بوون کەوا میریل پیاوێکی باشە و دڵ و دەروونی گەورەیە، بڕوایان نەدەکرد ئەو رۆژێک لە رۆژان دڵم نارەحەت بکات، یان کارێک بکات من دڵم گەرد بکات. خێزانەکەی من دڵیان بەوە خۆش بووە کـــەوا زەواجـــەکـــەی من لەلایەن خـــواوە پیـــرۆز کـــراوە، چونکە لەلایەن پێغەمبەرەکەی تایفەکەمانەوە بەرنامەڕێژی بۆ کراوە، ئەگەر بەرنامەکەش وەک خـــۆی جـــێـــبـــەجێ بکەم، بێگومـــان ئەگـــەر ئیـــمـــڕۆش دڵشـــادیش نەبم، ئەوە بەجێگەیاندنی ئیرادەکەی خوا بۆ من سەرفرازی و کامەرانییە.

شـــەو گـــەڕاینەوە هوتێل، ئەو هەر خـــەریکی دڵدانەوەی بابرەی ژنی بوو، بە

تەلەفۆن دڵی دەدایەوە و خەمەکەی سووک دەکرد و نەڤینی راستەقینەی بۆ دووپات دەکردەوە، چونکە دەیزانی ئەو بەو پرۆسەیە زۆر دڵتەنگە، کاتەکانی تریش هەر خەریکی سەیرکردنی تەلەڤزیۆن بوو. منیش یەک قسەم لە دەم دەرنەچوو، کە لەسەر سیسەمەکە درێژبووم هەوڵم دەدا جەستەم بەو نەکەوێت، کە دەیویست دەستم بۆ بهێنێت، من دوور دەکەوتمەوە و نارەزاییم نیشان دەدا، ئەویش دەکشایەوە.

بۆ رۆژی دووەم میریلی مێردم سەرقاڵی موزایدەکە بوو، لەو کارەدا چەند کەرەستەی بیناسازی کڕیبوو بۆیەش چەند جارێک پێوەندیی بە باربرەوە دەکرد، من بەوەیان دڵگران نەبووم، چونکە دەمویست هەر لە من دوور بکەوێتەوە و نەپرژێتە سەر من. کە بەیەکەوە گەڕاینەوە ماڵەکەمان لە شاری کۆلۆرداو شەوەکەی یەک دوو سەعات لە کن مایەوە و بۆ نووستن چووە ژوورەکەی باربرەی هەوێم.

بەیانییەکەی لەگەڵ باربرە بۆ کاروباری کۆمپانیایەکەی چوونە شاری بیچ، بە منیان وت، تۆش کاروباری ماڵەکە بکە و هەموو ئەندامانی خێزانەکە ناس بکە، کە میریل لە ماڵەوە دەرچوو من پێوەندییم بە مامۆستاکانی قوتابخانەکەمەوە کرد، کە ئەوان وتیان دەتوانیت لەسەر خوێندنەکەت بەردەوام بیت من دڵم خۆش بوو، وتیان هەفتەیەکت لە پێشە بۆ ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکانت.

وەک من خۆم دەمویست لە چەند رۆژێکدا هەموو تاقیکردنەوەکانم بکەم، بە تەواوبوونی ئەو تاقیکردنەوانە زۆرتر هەستم بە رووخان دەکرد و زۆرتر رەشبین دەبووم، لە ماوەی دوو هەفتەدا ژیانم سەرلەبن گۆڕا، چونکە چاکم دەزانی کەوا میریلی مێردم بوارم نادات من بچمە کۆلێجی پزیشکی، رەنگە هەر ئەوە قبووڵ بکات ئەگەر ببمە مامۆستایەک.

من ئەوەم دەزانی میریل پێویستی بە سکرتێرەیەک بۆ راپەراندنی کارەکانی لە شاری بیچ هەیە، باربرەش کاری سکرتێرەیی بۆ دەکرد، بەڵام زۆر سەفەری دەکرد و خەریکی کار و بەرنامەکانی ئەو بوو، کیژە گەورەکەشی کە ناوی

(مـارگـرێت) بوو، ئەویش لـە نووسـینگەکـەی ئەودا سـکرتێـری بـوو، بەڵام کـە شـووی کردووە و چوویتـە مـاڵە مێـردەکەی خـۆی لە شـاری سـۆڵت لیک، لەو کارەدا نـەمـاوە، بۆیەش دەمـزانی ئەو یەکـێکی دەویست سـکرتێریـی بۆ بکات، دەترسام من بۆ ئەو کارە دابنێت، بەوەش من لە پیشە و ئارەزووەکانی خۆم کە مـامۆسـتـایەتی بوو دوور دەکـەوتمەوە و ئەوەش زۆر نارەحـەتی دەکـردم، چونکە دەبووایە دەستبەرداری مەکتەبەکەم بم.

بەیانی ئەو لەگەڵ (ئودری) چوونە دەرەوە بۆ سـوارپاسکیلی، دیارە کەوا ئەو حـەزی لە سپۆرتی لێخـورینی پاسکیل دەکرد، ئودری کیژی گـەورەی ئەو بوو، شووی نەکردبوو لە ماڵەوە بوو، من لەوم پرسی دەبێ میریل ناچارم نەکات واز لە خوێندنەکەم بهێنم و لەگەڵ ئەودا کار بکەم، ئەو لە وەڵامدا وتی:

باربرەی ژنـی کـارەکـانی زۆر بۆ رادەپەڕێنێت، ئیشـی سکرتێریی بۆ دەکـات، ئەو ئیشـانەش دەکات و نۆ منداڵیشی هەیە و زۆر کەمیش لـەبەر ئەو کارانە بە مـــاڵەوە دەکـــەوێتـــەوە و بەردەوام لە دەرەوەیـە، بۆیەش بەدەگـمـــەن و جـــاروبار منداڵەکانی دەبینێت، رەنگە بۆ ژنێکی گەنجی وەک تۆ زۆریش ئاسایی بێت، نە منداڵت هەیە و ئیشی تریشت نییـە، رەنگە تۆ لەجیـاتی باربـرە دابنێت تا ئەو بکەوێتەوە ماڵەوە و ئاگەداری منداڵەکانی بێت.

کـە لـە ئودرییم پـرسـی، دەبێ باربـرە دڵی بە من بـکرێتـــەوە، رەنگە بە هـاتنی من نارەحـەت و سـەخڵـەت بێت، ئەو وا دەزانێ من شـوێنی ئەو دەگـرمـەوە، لە وەڵامدا ئودری وتی:

ئەوەیان راسـتـە، چونکە باربرە تاکـە ژنـی باوکـمانـە، لەودەمـەی ئەو هـاتووەتە ئەو مـاڵە، ئەو دەسـتـرۆیشـتـووی ئەو مـاڵە بووە، رەنگە بە هـاتنی تـۆ مەسـەلـەکان بگۆڕێت.

کە گـوێم لەو قسـانەی کیژەکە بوو، سـەرسـام بووم و بڕوام نەدەکرد، بۆیەش بە سـەرسامییە چاوم لە کیژەکە بڕی و پرسیم:

مەبەستت چییە ئەو تاکە ژنی باوکتە، ئەدی ئەوانی تر؟

کیژەکە بەو پرسیارەی من نیگەران بوو، بۆیە بەپەلە وەڵامی منی دایەوە و وتی:

دەزانی دواکەوتین، دەبێ زوو بگەڕێینەوە ماڵەوە.

## تاکە دەرفەت

بە قسەکانی ئودری زۆر تەنگاو بووم، لە دڵی خۆمەوە دەموت، باشە ئەو کیژە بۆچی نەیویست قسەکانی بۆم تەواو بکات، من حەزم دەکرد هەرچی زووە هەموو شتە تایبەتییەکانی ئەو خێزانە نوێیەم بزانم. یەک هەفتەبوو هەر بیرم لەو قسانە و لە رەفتارەکانی ماڵەکە دەکردەوە، لەو چەند رۆژە میریل تەنیا یەک شەو لەگەڵم دا خەوتبوو، بواریشم نەبوو لەگەڵ ئەندامەکانی خێزانەکە تێکەڵییەکم هەبێت. ئەو رۆژی دووشەمە بە سەفەر لەگەڵ نانسی کیژەکەی بەرەو بیچ بەڕێ کەوت، دڵم زۆر بەوە خۆش بوو کە منی لەو سەفەرەدا نەبرد، هیوام زۆربوو ئەو کیژەی بکاتە سکرتێری خۆی و ئەو لە شوێنی باربرە دابنێت، بۆ ئەو کارە روو لە من نەنێت، چونکە من زۆرتر مەبەستم خوێندنەکەم بوو، ئەگەر ئەو کارم بداتێ، ئەوە ناتوانم بچمە کۆلێجەکەم، بەوەش دەمتوانی داهاتووی خۆم دابین بکەم، بەوەش دەکرا پاشەڕۆژی خۆم مسۆگەر بکەم و موحتاجی دەستی میریلی مێردم نەبم.

کۆتاییی هەفتەکە رەوشەکەمان ئاڵۆز بوو، میریل دوو شەو لەسەریەک لەلای من مایەوە، بەیانی دووشەمە منی بانگ کردە نووسینگەکەی خۆی، داوای سازکردنی قاوەیەکی کرد، کە قاوەکەم بۆ برد بینیم باربرەی هەوێم لە تەنیشتی دانیشتبوو، لەوێ وتی:

بڕیارم داوە ئەو هەفتەیە کارۆلین لەگەڵ ئێمە بێتە شاری بیچ. کە باربرە ئەو پێشنیازەی مێردەکەی بیست، هەستی کرد مێردەکەی پشتی تێ دەکات، بۆیەش زوو تووڕە بوو، بە تەوسەوە سەیری دەموچاوی مێردەکەی کرد و وتی:

من وا دەزانم، ئێمە قسەمان لەو پرسە کردووە و بڕاوەتەوە و کارۆلین لە

ماڵەوە دەمینێتەوە و تەواو.

مێردەکەی تا ڕەوشەکە ئارام بکاتەوە هاتە وەڵام و وتی:

کارۆلین لە بیچ کار ناکات، ئەو تەنیا ئەو هەفتەیە لەگەڵمان بە سەردان دێتە بیچ.

ژنەکە وەڵامی مێردەکەی بە دڵ نەبوو، بۆیەش بە گریانەوە هەڵسا و بەپەلە بۆی دەرچوو. کە ژنەکە نووسینگەکەی جێ دەهێڵێت پیاوەکە یەکسەر دەچێتە شوێنی، بەیەکەوە ماوەیەک لە ژوورەکەی ئەو دەمینێنەوە، ئەوان دەرچوون و منیش بەتەنیا لە نووسینگەکە مامەوە، لەو دەمانەدا بیرم لەوە کردەوە بەراوردێ بکەم لە نێوان شێوەی ژیانی ئەو ماڵە و ماڵەکەی ئێمە، ئەوان چۆن دەژین و ئێمە چۆن دەژیاین، باوکم هەردوو ژنەکەی، دایکم و زڕدایکەکەمی بە یەک چاو سەیر دەکرد، لە نێوان هەردووکیان لە هەموو شتەکاندا جیاوازی نەدەکرد، بۆیەش لە ناو ماڵەوەماندا هیچ کێشە و ناکۆکییەکیان نەبوو. قسەکانی ئودری سەبارەت بە باربرە زۆر بووە جێگەی سەرەنجم، بۆچی بەو ژنەیان دەگوت ژنە تاقانەکەی میریل، مێردەکەم بەردەوام و زۆر لەلای ئەو دەمایەوەو کەم لەگەڵ ڕۆس و ڤۆنیتا دەمینێتەوە. کە تەلەفۆنی دەرکرد تەنیا لەگەڵ ئەو قسەی دەکرد، کە من گەیشتمە ئەو ماڵە ئەو لە پێگە و شوێنەکەی خۆی دەترسا، گومانی هەبوو من بتوانم دەسەڵاتی ئەو بهەژێنم، ئەگەر شەوێکیان لەگەڵ من دەمایەوە، بۆ بەیانی ئەو ژنە لەگەڵ مێردەکەی لالوت دەبوو، ئەویش هەموو ئیشێکی دەکرد تا ئەو ڕازی بکات و قەرەبووی مانەوەی شەوەکەی بۆ دەکردەوە، منیش لەوە زۆر نیگەران و حەیران دەبووم ئەگەر من ببمە سەرچاوەی نیگەرانی و کێشە بۆ ئەو.

پاش ئەوەی ئەو سەعاتێک لەگەڵ ژنەکەی لە ژوورەوە مایەوە و کۆششی کرد دڵی ئاشت بکاتەوە، میریل هاتە دەرەوە و وتی:

کلۆدیل بڕیارمان دا تۆ لە ماڵەوە بمینێیتەوە و دەستی ڕۆس بگریت و ئاکات لە کاروباری ماڵەوە بیت.

پێش ئەوەی ئەوان بچنە دەرەوە وتیان، دەکرێ چاوت لە کوڕە نۆ مانگییەکەی باربرەش بێت و جاکسون بە تەمای چاودێری تۆوە لەماڵەوە جێ دەهێڵین.

لەو ڕۆژەوە دڵنیا بووم کەوا لەو ماڵەدا هەموو بڕیارەکان لەدەست باربرەیە، کە میریل دەبێژێت من خاوەن هەموو بڕیارەکانی ناو ماڵەکەم تەنیا قسە و خۆدەرهێنانە و بەس، بۆیەش زۆر تووڕە بووم و وتم:

ئەگەر هەوێیەکەم ئەوەندە زەبربەدەست بێت، ئەوا من هەرگیز نەمتوانی خوێندنەکەم تەواو بکەم.

کە ئەو قسە و ڕاسپاردەکانی تەواو کرد، شان بەشان ژن و مێردەکە دەرچوون و هیچ خواحافیزێکیان بە من نەوت، ژنەکە ئەوەشی نەوت چۆن من ئاگەداری ئەو منداڵە ساوایە بم، ئەو چی دەوێت، چۆنی بەخێو بکەم، یەکسەر بۆی دەرچوو، بۆیەش من سەبارەت بەو منداڵە نەمدەزانی چ بکەم، تووشی شۆک هاتم، ئەگەر دایکی خۆی دڵی پێوە نەبێت، من چ بکەم، ئەو نەک خەمی ئەو کچکەیەی نەبوو، خەمی منداڵە وردەکانی تریشی نەبوو، هەموویانی بەو شێوەیە جێ دەهێشت و لێی دەدا و دەردەچووە دەرەوە.

## ئالۆزییەکان کوشندەتر دەبوون

کە بەیەکەوە من لەگەڵ مێردەکەم سەفەرم دەکرد، ئەو بەردەوام خەریکی تەلەفۆنکردن و نووسینی تێبینی و مامەڵەکردن و دانوستانکردن بوو لەسەر سەفقە بازرگانییەکانی، بۆیەش باش یەکترمان هەر نەدەناسی، ئەو زۆریش بایەخی بە ناسینی من نەدەدا، ئەو مەبەستی نەبوو پێوەندیی بە من گەرم بێت نەوەک بابرەی ژنی سەخڵەت بێت.

لە کۆتاییی هەفتە من لەگەڵ میریل دەرچووم، بەوەیان هەوێیەکەم زۆر تووڕە بوو، بۆیە هەفتەیەک ماڵەکەمان ئاڵۆزیی پێوە دیاربوو، هەر لە ڕقی ئەو دەرچوونەمان باربرە لە ماڵەوە دەردەچوو، بۆ دڵدانەوەی ئەو پیاوەکەم زۆر

خەریکی دەبوو، کە لە دەرەوە دەگەڕایەوە، دەچووە ژوورەکەی خۆی، بواری بە کەس نەدەدا سەری لێ بدەن، هەتا منداڵەکانیشی نەدەبوو لێی بچنە ژوورەوە، ئەگەرچی ماوەی هەفتەیەکیش بوو لەوان دووربوو، هەستم دەکرد لە ئاکامی ئەو رەوشتە و ئەو رووداوانە بەردەوام لەماڵەکەمان کێشە و نارەحەتی هەبوو، هەر جارە و شتێکی بەروومدا دەکرد، لە ئەنجامدا هەموومان تێدا زەرەرمەند دەبووین.

من بۆ نووستن چوومە ژوورەکەی خۆم، من هەستم دەکرد من کەسێکی نەفام بووم کە پێشتر لەگەڵ یەکێکی تر پێوەندییم نەکردبوو، بۆ پیاوێکی ترم نەدەناسی، بەوەش من دووچاری ئەو رۆژە نەدەبووم، لەگەڵ میریل نەدەکەوتە ئەو گێژاوە، ئەگەر من دۆستێکم هەبووایە بێگومان منی لەو چارەنووسە رەشە دەرباز دەکرد، ئەگەری زۆریش هەبوو، لەو دۆستایەتییەدا لەجیاتی ترس و دڵەراوکێ و شەرمەزارییەوە خۆشییەکی بە من بەخشیبووایە، ئەو شەوەی من زۆرم بیر دەکردەوە، میریل نەهاتەوە ماڵەوە و کەشەکەم ئاڵۆز نەبوو.

بۆ بەیانی ئودرییم بینی، بە کیژەکەم وت، تاقەتت هەیە بەیەکەوە سواری پاسکیل بین، پیاسەیەک بکەین، ئەویش یەکسەر رازی بوو، کاتەکە زوو بوو، بەیەکەوە دەرچووین، گەیشتینە نزیک بەردێکی گەورە لەسەر کەناری رووبارەکە، لەوێ بۆ پشوودان راوەستاین، ئودری تاکە کەسی ماڵەکە بوو منی بە نەرمی دەدواند، لەگەڵ مندا رووی خۆش بوو، دەمزانی هەر ئەو هەیە نهێنییەکانی ئەو خێزانەم بۆ ئاشکرا بکات و یارمەتیم بدات.

ئەو وتی کە میریلی باوکم، لەگەڵ باربرە زەواجی کردووە، چی تر لەگەڵ دایکم نەدەنووست، ئەوەی لە بیر دەچێتەوە کەوا ژنێکی بەناوی ڤۆنیتا هەیە، باربرە ئەو ژنەی لێ قەدەغە کردبوو، بواری نەدەدا بێجگە لە خۆی لەگەڵ کەسی تر سێکسیش بکات.

هەردوو ژنەکەی تری میریل نەگبەت بوون، دایکی ئەو لەلایەن پێغەمبەرەوە بۆی دانرابوو، چونکە میریل حەزی لە کیژێکی دەرەوەی تایفەکەیان کردبوو، کە باوکی ئەو پێوەندییە رەفز دەکاتەوە، میریل پێوەندییەکە لەگەڵ دۆستەکەی

ناپچـڕێنێت و هیـوای زۆر بوو بـاوکی دڵی نـەرم بێت و ڕەزامـەندی لەسـەر هێنانی ئەو کیژە بکات کە لە تایفەیەکی تربوو، بەڵام مامە ڕوی زوو بەهانای باوکی دێت و دایکی منی بۆ دەدۆزێتـەوە، دیارە کـەوا مـیـریل قـسـەی ئەو ناشکێنێت، ئەگـەرچی لە سـەرەتـادا بەڵێنی دابوو لەگـەڵ هیچ ژنی تر هاوسەرگیری نەکات، بێجگە لە دۆستەکەی، بەڵام مامە ڕوی دووبارە فەرمانی پێ دەدات بچێتـە لای ژنەکەی، بەوەیان میریل ڕازی دەبێت، لەگەڵ ڤۆنیتا بنووێت، کـە مـامــە ڕوی باوکم ناچار دەکـات وەک ژن بە دایکم ڕازی بێت، ئەویش تۆڵەکە لە دایکم دەکاتەوە، ئازاری دەدا و تەنیا منداڵی لەو دەویست، پاش ڕابواردنی چەند سـاڵی تاڵ و کـولەمـەرگی لەگـەڵ دایکم مـیـریلی باوکم ژنێکی تر دەهێنێت، ئـەوجارەش لەلایەن مـامـە ڕوییـەوە ناچار دەکرێت ڕۆس بهـێنێت، بەڵام ڕۆس لـە ڕووی دەروونیـیـەوە دڵخـۆش نەبوو، ئەویش زۆر مـەبەستی نەبوو لەگـەڵ ئەو ژنە پێوەندییـەکی سۆزداری هـەبێت. بەڵام ئەوەیان زۆر نـاخـاتێنێت و ئەو جـارە میریل باربرە دەناسێت، ئەو خـوشکی ڕۆس بوو لە دایکی، کە میریل باربرە دەهێنێت تەمـەنی سی و هـەشت ساڵ بوو، کیژەکەش تەمـەنی تەنیـا هـەژدە سـاڵان بوو، ئەو کـەسـە لە دەسـەڵات و سامـانداریـیـەوە بەیەکەوە زۆر تەبا و کۆک بوون، بەپێچەوانەی هـەردوو پرۆسـە بەدبەختییـەکەی پێشووی، کە لە هـەموو ڕووییەکەوە گۆشەیەکی سەرکەوتنی تێدا نەبوو.

من لەوە تـێ نەدەگـەیشـتـم چ نـهێنییـەک لەوەدایە کـە مـیـریل بۆ بەڕووی باربـرەی ژنی وا لاوازە، ئودری بۆی گـێـڕامـەوە کـەوا باوکی حـەز لە باربرە دەکـات، بۆیـەش ئەو ژنـە هەرچەند خـراپەش لەگـەڵ ژنـەکـانی تر و لەگـەڵ منداڵەکانیش بکات، ئەو هیچ کاردانـەوەیەکی نەبووە، هەر کە ئەو ژنە لەو ماڵە دەردەکەوت مـاڵەکە ئاژاوەی تێ دەکەوت، ئەو دەسـەڵاتی بەسەر هـەموو شتێکی ئەو مـاڵەدا هـەبوو، هـەمـوو لایەنەکـانی بۆ بەرژەوەندییـەکـانی خـۆی کۆنتـڕۆڵ کردبـوو، لە سـاڵانی یەکـەمی پرۆسـەکـەیان ئەگـەر باوکمـان لەگـەڵ یەکـێک لە ژنەکـانی تـری سـەفـەرێکی کردبـووایە، ئەو باربرە یەخـەی دەگـرت و دنیـای لی وێک دەهێنایەوە، میریلی باوکیشمان بەردەوام لایەنگیری ئەوی گرتووە.

ئەو ژنە هەموو بەرنامەکانی بۆ ئەوە بوو، ئەو ژنی تاقانە و یەکەمی بێت، ئەگەرنا ژیانی مێردەکەی دەکردە جەهەنەم، بۆیەش ئەو بەناچاری بەردەوام رادەستی ئەو دەبوو، بۆ ئەو دەبووە خاک و خۆڵ، من لەو ماوەیە کورتەی لە ناو ئەو خێزانەدا ژیام لەو وردەکارییە باش تێگەیشتم، باربرە بە وردی چاودێری مێردەکەی دەکرد، هەرگیز بواری نەدەدا تەنیا بمینێتەوە و سەربەخۆیانە رەفتار بکات.

ئودری بۆ منی دەگێڕایەوە کەوا باوکم تەنیا بۆ سکبوون لەگەڵ رۆسی ژنی دەنووست، مەبەستی سێکس و خۆشی نەبوو، چونکە دەیزانی منداڵەکانی ئەو لەوانی تر جوانترن، بۆیەش زۆرتر مەبەستی بوو ئاوسی بکات. بەڵام باربرە رۆسی بە چاوی خزمەتکار سەیر کردووە و بەردەوام فەرمانی پێ کردووە و کارەکانی ناو ماڵەوەی بەو دەکرد و بە هەڵەیەکیش ئابڕووی دەبرد.

لە قسەکانی ئودری ئەوەم بۆ روون و ئاشکرا دەبوو کەوا من هەتا مردن لە ناو دۆزەخ دەبم، ناتوانم هیچ لە چواردەورەکەم تێ بگەم. ئودری دەیوت، میریل لە دایکمی دەدا، لە سەربانی خانووەکەمان بەندی دەکرد، ئەوەش لە تۆڵەی ئەوەبووە کە ویستوویەتی بە رووی باربرە قسەیەک بکات، کە لە دایکمی دەدا جێ لێدانەکانی زۆر دەمایەوە و زۆریش ئازاری بەردەکەوت.

بەپێی سرووتەکانی کۆمەڵەکەمان ژن مولکی پیاوە و ناکرێ گلەیی لە رەفتارەکانی پیاوەکەی بکات، کەس بەرگری لە ژن ناکات، ئازار و لێدان بەرووی ژنانەوە بەشێک بوون لە رۆژانەی ناو کۆمەڵەکەمان ، ئەو ژنەی لە قسەی مێردەکەی دەرچووە، ژنێکی تاوانبار بووە، هەموو حەقەکانیش بەردەوام لە کن پیاوەکان بووە، کە پیاویش لە ژنی داوە، دیارە خەتای ژنەکان بووە و خراپیش بۆ ژنەکان شکاوەتەوە و بە شووڕەییش حیساب کراوە. لەو روانگەوە ژنان نەکراوە شکایەت لە رەفتار و رەوشتی بەدکاری مێردەکانیان بکەن، چونکە بە کەسانی یاخی و دەرچوو لە نەریتەکان ناویان دەهات.

## پیاوەکان لە تاریکی لەگەڵ ژنانەکانیاندا سێکسیان دەکرد

لە ناو داوونەرتی کۆمەڵەکەم ئەوە هەبوو، ئەگەر پیاوێک لەسەر منداڵەکانی زاڵ نەبێت، کەسایەتی لە ناو خەڵکەکە بە لاواز سەیری دەکرا، لە ناو تایفەکەیان کە لەرزۆک دەبێت و بەر تۆڵەی ڕوحی خواش دەکەوێت. تا ژنەکان قسەی ئەوەی لەسەر نەبێت کە مێردەکەی سێکسی لەگەڵ ناکات، لەگەڵ یەکێکیان دەیکات لەگەڵ یەکێکی تر نایکات، پیاوەکان دەیانویست هەموویان بەردەوام ئاوس بن، بەڵام لە ڕاستیدا وا نەبوو، تەنیا باربرە ژنی یەکەمی میریل بووە و زۆرتریش شەوەکان لەگەڵ ئەودا دەمایەوە، ئەو بە ڕوح و بە جەستە تەنیا لەگەڵ باربرە بووە.

ئەوەی لە ماڵەوە زانیم کەوا میریلی مێردم بەنیازە من و دوو ژنەکەی تری سەفەرێکی خێزانیمان بەرەو هاوای پێ بکات، من لەلایەن خۆمەوە بڕیارم دابوو، ئەگەر دوا سەفەری ژیانیشم بێت من لەگەڵیاندا ناچم. لە ناو تایفەکەی ئێمە هەرگیز بوار نەدەدرا ژنان بە تەنیا سەفەر بکەن، من بڕیاری خۆم دابوو، ئەگەرچی (نامی) پێی وتم کەوا پارەی سەفەرەکەمان لەلایەن باوکمەوە بووە، ئەو لە مێردەکەم دەچێتە ژوورەوە بە میریل دەڵێت کارۆلین بڕیاری داوە باوکیشی پارەی سەفەرەکەی بدات، ئەو سەفەرتان لەگەڵدا ناکات. ئەو وتبووی پارەی پلیتەکانی هەموومان لەلایەن باوکی کارۆلینەوە دراوە، بۆیە ئەو لە هەمووتان حەقترە ئەو سەفەرە بکات، لە کۆتاییدا منم کە بڕیار دەدەم کێ هاوشانمان بێت، هەر منیش دەتوانم بڵێم کێ لەگەڵماندا بێت.

لە هاوای تەنیا ئێمە جلی نامۆمان لەبەردا بوو، خەڵکەکە لە هەوارگەکە هەموو بکینی و پانتۆڵی کورت و تیشێرتیان لەبەردا بوو، ئێمەش جلی پۆشتەی درێژمان لەبەربوو، هەموو خەڵکەکە بەچاوێکی سەیر و نامۆ

تەماشای ئێمەیان دەکرد، وەک ئێمە لە ئەستێرە و هەسارەیەکی ترەوە هاتبین، لە ئاسمانەوە دابەزیبین، بەڵام ئێمەش دیدی خەڵکەکەمان لا گرینگ نەبوو، چونکە تەنیا ئێمە بووین کە میللەتی هەڵبژارد و پیرۆزی خواین.

ئێمە ژنەکانی ئەو، پشبڕکێمان دەکرد تا زۆرتر لە مێردەکەمان نزیک ببینەوە، دیارە ئەویش ئەو رەوشەی زۆر پێ خۆش بوو، هەموومان کۆششمان دەکرد، بێتە باوەشمان و سێکسمان لەگەڵدا بکات، بەپێی داوونەریتی تایفەکەمان پیاوان نەدەبوو لەگەڵ ژنی ئاوس سێکس بکەن، دەبوایە ژنەکان لەو نۆ مانگەدا سێکس نەکەن، بەڵام ئەو پیاوانەی مۆڵەت و ئیزنی ئاسمانیان هەبووایە دەکرا ئەوان لەو مانگانە لەگەڵ ژنە ئاوسەکانیان سێکس بکەن.

## ئاژەڵێکی تۆپیوو

من ئەوەم نەدەزانی بۆ مێردەکەم شەوانە بۆ سێکس نایەتە کن من، کە ئاوس بووم یەک شەویش ئەو نزیکم نەکەوتەوە، نۆ مانگ لە خۆشی سێکس بێبەش بووم، من ئەوەم نەدەزانی سێکسکردن لە کاتی ئاوسبووندا حەرامە، تایفەکەمان بوار نادات، نەمدەزانی چونکە ئێمە وەک ژن و مێرد کە لە کاتی ئاسایی سێکسمان کردووە بە هیچ شێوەیەک بەیەکەوە قسەیەکمان نەکردووە، دەنگمان نەهاتووە، یان پێش یان پاش سێکسکردنەکە قسەیەکمان لەسەر سێکسکردن نەکردووە، من هەرگیز مێردەکەم بە رووتی نەدیبوو، چونکە سێکسمان لە تاریکیدا دەکرد، کارەکەش ئاسان و سادەبوو، بەچەند دەقەیەک زەوقەکە تەواو دەبوو، لە کاتی زەوقکردنەکەش میریل یەک وشەی لە دەم دەرنەدەچوو، کە ڕەحەت دەبوو، کەمێک لەسەر سکم دەمایەوە، منیش تەنگەنەفس دەبووم، چ نەدەما بخنکێم، نەدەکرا دەنگم لێوە بێت و بڵێم هەڵسە خنکام، ئەو کە تەواو دەبوو، جەستەکەی دەهاویشتە تەنیشتم وەک ئاژەڵێکی تۆپیوو دەکەوت.

لە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو، ئێمە بە جلی ژێرەوەی درێژ سێکسمان

کردووه، یەک شەو کە سێکسمان کردووە بۆ یەک رووت بووینەوە، ئەو شەوەی لە هاوای بووین، ئەو شەوە من زۆرم لا سەیر بوو، بەوەیان سەرسام بووم، ئەو منی رووت دەکردەوە، هەموو جلەکانی لەبەرم کردەوە، دەستی بە هەموو ئەندامانەکانی جەستەم دادەهێنا، ئەو شەوە زۆر لە شەوانی تر جیاوازبوو، زەوقەکە جیاواز و تایبەتی بوو، زۆر خۆشمان رابوارد، من نەمدەویست سۆزی خۆم زۆر بورووژێنم، چونکە دەمزانی ئەوەیان یەکەم و دوا شەومان بوو سێکس بەخۆشی و بەو شێوەیە بکەین، دڵنیابووم ئەو شەوە دووبارە نابێتەوە.

لەکن هەموو ژنێک لە کۆمەڵەکەمان پشتیوانیان لە پیاوەکانەوە دەخواست تا هێزداربن، تەنیا من نەبێت، من هەستی دوژمنانەم بەرووی مێردەکەمەوە هەبوو، نەک حەزم نەکردووە لەگەڵ ئەودا بنووم، من لە سەرەتاوە حەزم نەکردووە شووشی پێ بکەم، ئەوم وەک دوژمن دیوە، ئەگەر رەحەتم کردووە و دڵم خۆشیش کردبێت، لەبەر دڵشادکردنی منداڵەکانم بووە، لەبەر خاتری ئەوان بوو رووم لە مێردەکەم کردووە، ئەوەشمان باش دەزانی نەوەیەکی تەواوی ژنانی کۆمەڵەکەمان وابوون، وەک من دەجووڵانەوە و سۆزیان بەو شێوەیە بووە.

تا بتوانم لە ناو خێزانەکەی میریل کارەکانم راپەڕێنم و پێگەیەکم هەبێت، دەبووایە خۆم وەک کەسێکی دەسەڵاتدار نیشان بدەم، ئەوەش بۆ من زۆر گرینگ بوو، بەوەش من توانیبووم رەوشێکی تایبەتیم هەبێت و خۆم لە هێرشە درەکانی ئەوان بە شکۆوە رابگرم، لەو کۆمەڵگەیەی هێرشەکان لەلایەن ژنەکانی تر و منداڵەکانی ترەوە بەترسناکی دەکران، کە تێدا ناکۆکییەکان ناشەریفانە بوون و مانەوە و بردنەوەش بۆ کەسە بەهێزەکان بوو، دەبوایە بەوریایی و بەهێزەوە بێمە ئەو مەیدانە. هەردوو هەوێیەکەم دەیانزانی بوونی من و رەوشی من مەترسی لەسەر ئەواندا هەیە، من دەتوانم لە ناو ئەو خێزانەدا قەوارەیەکی چەسپاوم دەبێت، بۆیەش ئەو دوو ژنە لە بوونی من و لە چالاکییەکانم نیگەران بوون، چونکە هەر بایەخ و پێگەیەک لە میریلی مێردەکەمانەوە بە من بدرێت بێگومان لەسەر حیسانی ئەوانی ترەوە دەبێت،

بۆیەش زۆر ئاسایی بوو ئێمە هەر سێ ژنەکە لەو ماڵەدا کۆششمان دەکرد پیاوێک بۆ خۆمان رابکێشین کە خۆشمان ناوێت، حەزی لێ ناکەین، لە ئەسڵدا وەک مێرد و هاوسەر قبووڵمان نەبووە و لەبەر رۆشناییی نەریتەکانی تایفەکەمان شوومان بەو کردووە و ناچار کراوین.

## کابوسێکی ترسناک

ئێستا کاتی بڕیاردانی دەربازبوونەکە بوو، پاش ئەوەی ماوەیەکی درێژ ئازارم بەدەست میریلی مێردەکەم و خێزانەکەی چێشت، هیچم لە خەیاڵدا نەما بۆ خۆم و منداڵەکەم بێجگە لەوەی خۆم لەو خێزانە دەرباز بکەم. لوانی کیژم خەونێکی ترسناک هەراسان دەکات، لەو خەوەدا هەمووومان رامان کردووە و ژیانمان بەترسە و لە هەموو گۆشەیەکەوە راو دەنرێین و هەراسان دەکرێین، بۆیە ئەو لە من دەپاڕێتەوە بگەڕێنەوە ماڵەوە، هەموو خوشک و براکانی خستبووە گریان و پاڕانەوە تا بگەڕێینەوە لای باوکیان، ئەو ناخوازێت لەو ماڵەی شاری کۆلۆرادو بژین. ئەو لەو خەونەدا زۆر ترسابوو، دەیوت دایە لەسەر ئەو کردەوەیە دەچینە ناو ئاگر و دەسووتێین، بەڵام کە لە خەوەکە بەئاگا هاتووە زانیویەتی راستی نەبووە و کابووسێکی ناخۆش بووە، ئەوەی بە کامەرانییەوە دەگێڕایەوە، بەڵام ئەو چی تر خەونی لەو جۆرەی نەدیتەوە. من ژیانم ترووسکاییەکی جوانی تێدا نەمابوو، نەدەکرا چی تر بەرگەی میریل بگرم، پێوەندی و سۆزی نێوان من و مێردەکەم تەنیا سێکسەکە بوو، من ژنی ئەو بووم تەنیا بۆ هەوەسی شەوەکانی ئەو. لە کۆتایی بڕیارم دا منداڵەکانم بخەمە ناو ئۆتۆمۆبێلەکەم و هەموویان ببەمە شاری سۆلت لیک و خۆمان دەرباز بکەین.

منداڵە گچکەکانم بەو گیانبازییە و بەو دەربازبوونە دڵیان خۆش بوو. گەورەکانیش ژمارەیەکیان کامەران بوون، بەڵام بەشێکیان دژی بڕیارەکەی من بوون، هەڕەشەی ئەوەیان دەکرد کەوا موستحیلە ئەو نەبەردییە سەربگرێت، کە دەنگمان دەرچوو و زۆریش قسەمان لەسەر دەکرد، منداڵە گچکەکان لە

ترسانا خۆیان مات کردبوو، پێنج سەعات بوو لە ناو ئۆتۆمۆبێلەکە دەڕۆیشتین و هەمووومان دەنگمان دەهات و دۆزەخێکمان ساز کردبوو.

دایکم پێوەندیی بە دوکتۆری ددان (دان فیشر) کردبوو، ئەو جاران ئیماندارانی تایفەکەمان بوو، کە لەگەڵ تایفەکەدا بووە سێ ژنی بەیەکەوە هەبووە، بەڵام کە بڕیار دەدات لە کۆمەڵەکەمان دەربچێت تەنیا یەک ژنی لەگەڵدا دەمێنێتەوە و دووەکەی تری دەڕۆن، ئەو لە شاری سۆلت لیک کلینکێکی هەبوو، لەسەر راسپاردەی دایکم ئەو ئێمەی قبووڵ کردبوو.

ئەوەی نیازبووایە لەو کۆمەڵەیە و لە سرووتە سەیرەکانی دەربچێت ئەو دوکتۆرە و کۆنە ئەندامەی کۆمەڵەکەمان یارمەتی دەدا، بۆیە هەر ئەویش بوو ژیانی من و منداڵەکانی دەرباز کردم، سەرەتا لە ماڵی براکەم ماینەوە، دوایی لەوێ دەرچووین، پاش چەند سەعاتێک لە دەرچوونمان وتیان دەستەیەک لە پیاوانی تایفەکەمان ماڵی براکەمیان گەمارۆ دابوو، بەشەیداییەوە لە من و لە منداڵەکانم گەڕابوون، ئەو خانووەی دوکتۆر فیشر بۆ ئێمەی ساز کردبوو، یەکێک بوو لەو پێنج شوقەیەی ئەو هەیبوو، شوقەکان لە ناو یەک بینایەدا بوون.

لینی ئێمەی بردە خانووێک هەشت ژووری نووستن و ژوورێکی دانیشتنی گەورە و یەکێکی خواردنی تێدا بوو، لەوێ هەستمان بە ئازادی دەکرد، وام دەزانی لە پاش شووکردنەکەم من بەرەو ئاسمان بەرزبوومەتەوە، بۆیە کەوتمەخۆ تا خواردن و پێویستییەکانی منداڵەکانم دابین بکەم.

فیشر لەگەڵ من دانیشت، لە رەوشی خۆم و منداڵەکانم پرسیاری لێ کردم، دەیویست لە رابردوومان هەندێ زانیاری وەربگرێت، منیش راستییەکانم پێ وت، وتم من دەرچووی کۆلێجی پەروەردەم، بکالۆریسم هەیە، حەوت ساڵ کار و پیشەی مامۆستایەتیم کردووە، بەڵام کە وتم من ژنی میریل جیسوبم، بە ناوهێنانی ناوی ئەو هەڵوەستەیەکی کردو هەڵسایەوە سەر پێیان و بە سەرسامییەوە سەیری منی کرد و وتی:

وتت مێردەکەم میری جیسوبە؟

منیش وەڵامم دایەوە و وتم:

بەڵێ من هاوسەری ئەو پیاوەم. ئەو وتی:

مەبەستت ئەوەیە بڵێیت کەوا من منداڵەکانی میریل جیسوبم حەشارداوە؟

منیش بە سادەییەوە وتم:

بەڵێ، هەشت منداڵی ئەو پیاوەت لەلایە.

کە دوکتۆر فیشر ئەو قسەیەی زانی و تێگەیشت کەوا من ژنی ئەو پیاوەم، رەنگی هەڵبزرکا و تێکچوو، لەودەمانە ئەو وتی، من لە نووسینگەی مودعی گشتی داوا دەکەم پارێزگاری بکرێن. منیش لە دڵی خۆمدا وتم، من بۆ پارێزگاری منداڵەکانم هەموو شتێک دەکەم.

## بەرەکەتێک لە ئاسمانەوە

فیشر زۆر بەخێرایی ئێمەی بەجێ هێشت، لەو دەمانەوە هەستم کرد کەوا ئێمە چەند بێ دەسەڵاتین، دەترسام، نیگەران بووم و تێگەیشتم هەموومان لە رەوشێکی مەترسیدایین، کە گەڕامەوە ژووری میوانان بینیم ئارسەری کوڕم دیار نییە، من بیرم بۆ ئەوە رۆیشتبوو کەوا ئارسەر خۆی گەیاندبێتە نزیکترین بۆکسی تەلەفۆن تا باوکی ئاگادار بکاتەوەو بڵێت دایکم ئێمەی فڕاندووەو داوای یارمەتی لێ بکات.

دەمزانی ئارسەر هیچ پارەی پێ نییە، بۆیەش دڵنیابووم ناتوانێت تەلەفۆن بکات، بەڵام دڵم هەر دەترسا، بەپەلە خۆم گەیاندە ماڵی لینی و ویستم زوو لەوەیان ئاگەداری بکەمەوە، ئەو پێی وتبووین وا باشە بچنە ماڵەکەی جۆلین، ئەوێ بۆ ئێوە ئەمینترە، بۆیەش من بەلەز کەلوپەلەکانم کۆ کردەوە و منداڵەکانم گەیاندە نوایەکی تر. جولین تازە لە کۆلێجی ددان دەرچوو بوو کەم کەسی لە تایفەکەی ئێمەی دەناسی، جولین بە منداڵەکانی منی وت، لەو خانووەدا دەزگایەکی ئینزاری هوشیارکردنەوە دانراوە، ئەوەی بیەوێت دەرگە

و پەنجەرەکان بۆ دەرچوون بکاتەوە ئینزار لێ دەدات و بەو ئاگەدارکردنەوەش یەکسەر پۆلیس دەگاتە سەرمان.

ماوەیەکی کورت بوو ئێمە لە ماڵەکەی جولین دامەزرابووین بینیمان (سارا) لێمان بەژووریێ کەوت و دەستی ئارسەری گرتبوو، ئەو لە دووری چەند میلێک لە ئێمەوە دوور کوڕەکە دەدۆزێتەوە. لەودەمانە میریلیش دەگاتە ماڵەکەی دوکتۆر فیشر، ئێمە هەر پێنج دەقە بوو دەرچووبوین، کە زانیبووی ئێمە لە ماڵەکەی ئەو دابەزیووین، بەپەلە دەگاتە ئەوێندەرێ.

ئەو پێش ئەوەی پارێزگاریمان بۆ دابنێن گەیشتبووە شوێنەکەمان. تا من بتوانم منداڵەکانم لەلای خۆم گل بدەمەوە کەوتمە ناو گێژاوێکی دوور و درێژی دادگاوە، ئەگەر ئەودەمانە ئارسەر لە ماڵەکە دەرنەچووبوایە، ئەوە ئێمەش گومانمان لەوە نەدەکرد ئەو بۆ پێوەندیی بەباوکییەوە رۆیشتووە شوێنەکەمان نەدەگواستەوە، دەرچوونەکەی ئەو بەرەکەتێک بوو لە ئاسمانەوە بۆمان دابەزی. لەو کارەوە ئەوە فێر بووم تا کارەکانم جوان راپەڕێت دەبێ هەموو بەرنامەکانم زۆر بەنهێنییەوە بکەم، ناکرێ کەسیان لە بەرنامەکانم ئاگەدار بکەمەوە، زۆری نەخایاند نوێنەری مودعی گشتی گەیشتە لامان تا داوای فەرمانی پارێزگاری بەلەز داوا بکەم، ئەو بە منی وت، بە منداڵەکان بڵێم کەوا هەمووتان لە ژێر چاودێری مودعی گشتین، منیش ژمارەی تەلەفۆنی یەکێک لە کەسە نزیکەکانی میریلی مێردم بۆ نووسین، بەڵام ئەویش لەلایەن خۆیەوە بەردەوام سۆراخی دەکردین، بۆ دۆزینەوەمان وەستانی نەبوو.

کە مێردەکەی جولین هاتەوە ماڵەوە بە منداڵەکانی وت، وەرن فیلمی شرێک ببینن، ئەوان لەبەر رۆشنایی رێنوێنییەکانی پێغەمبەرەکەی تایفەکەمان هەرگیز فیلمیان نەبینیبوو. ئارسەر کوڕە گەورەکەم بەردەوام لاساری دەکرد، لای باوکی بەرنەدەدا و رووی لەوە بوو بگەڕێتەوە لای باوکی، منیش بەنەرمی قسەم بۆ دەکرد، کەوا دەربازبوونەکەمان لە بەرژەوندی ئەواندایە و هیچ بواری ترمان نەبوو، بێجگە لەوەی بەو شێوەیە خۆمان دەرباز بکەین.

کە بڕوام بە ئارسەر پەیدا کردبوو، رۆژێکیان وتی، من دەمەوێ لەگەڵ خاڵم

بچمە سەر کار، منیش بیرۆکەکەم لا باش بوو، کە بەیانی ئارسەری برام هات، منی جیا کردەوە و بەتەنیا قسەمان کرد، ئەو وتی:

من وا دەزانم تۆ هێشتا نازانی گەورەیی ئەو کارەساتەی تۆ دەیکەیت چەندە، هەموو خەڵکی شارەکە بەدوای تۆدا دەگەڕێن، لە هەموو گۆشەیەکدا بۆت دەڕوانن، من بڕوام وایە تۆ کارێکی زێدە ترسناکت کردووە، رەوشەکە جێگەی مەترسییە، راستە تۆ داوای پارێزگاری مودعی گشتیت کردووە، بەڵام من دەزانم میریل گوێ بە یاسا نادات، من بۆ سەلامەتی ئێوە دەترسێم و هەست دەکەم نیگەرانم، دەرچوون و دەربازبوون لەو تایفەیە موستحیلە.

## شەڕێکی دۆڕاو

کە ئەو قسەکانی تەواو کرد، من سەیری ئەوم کرد و وتم:

من لەو ژیانەدا هیچم نییە بیدۆڕێنم، من مردنم لەو ژیانە پێ خۆشترە، هەموو شتێک دەکەم بۆ ئەوەی منداڵەکانم بپارێزم، کۆڵ نادەم و لەبەر ئەوان کۆشش و قوربانی دەدەم. ئارسەری برام وتی:

دەزانی تۆ منداڵی کەسێکی زۆر بەدەسەڵاتی ئەو کۆمەڵەیەت هێناوە، دەرئەنجام تۆ هەر دەدۆڕێیتەوە، چارەت نییە، بڕوا ناکەم ئەو بوار بدات منداڵەکانی ئەو بفڕێنیت، کارۆلین دەزانی شەڕەکەی تۆ لە سەرەتاوە دیارە کە دۆڕاویت.

بەیانییەکەی فیشر هاتە لامان و ئەوەی پێ ڕاگەیاندین کەوا فەرمانی پارێزگاری بەپەلەکەمان کەوتە واری جێبەجێکردنەوە، بەوەش ئەگەر میریل یەکێک لە منداڵەکانم بباتەوە، ئەو دووچاری لێپرسینەوەی توند دەبێت، بۆیەش بە منی وت، من و هاوسەرەکەم بە گەڕانەوەت بۆ ماڵەکەی ئێمە شادومان دەبین، دەکرێ لەو رۆژەوە بە ئارەزووی خۆت دەتوانیت لەلای ئێمەش بمێنییتەوە. فیشر ئەوەشی پێ وتم، کە تۆ ئێستا لەو رەوشەی کە یاسا و پارێزگارییەکان لەگەڵ تۆدایە، دەتوانیت سەردانی نووسینگەی مودعی گشتی

بکەیت، لەوێ هەر چ سەبارەت بەو تایفە دەزانیت بۆیان روون بکەیتەوە، نهێنییەکانی ماڵەوەیان بۆ ئاشکرا بکەیت، سەبارەت بە رەوشی منداڵە تەمەن ژێر هەژدە ساڵییەکانیان قسەیان بۆ بکەیت. منیش حەزم دەکرد ئەوەیان بکەم، بەڵام جورئەتم نەبوو، فیشر سەربەستانە قسەکانی بۆم دەکرد و هانی دەدام، ئەو وتی، من ئەو ژنانەی هاتوونەتە لام بەو شێوەیە رێنوێنیم کردوون، ترست نەبێت یاسا پشتیوانیت دەکات. ئەو مەبەستی بوو کەوا ژنێکم بڕوانامەی زانکۆم هەیە، لەو ژنانەی پێشووتر بۆ ئەو چالاکییە باشتریت، ئەوانەی کە روویان لە من ناوە و هاتوونەتە لای من زۆریان دەرچووی قوتابخانەی ناوەندی بوون، یان کەمتریش، ئەوان هیچ پیشەو دەسترەنگینییان نەبووە، تۆ وەک ئەوانە نیت، ئەو وتی من قسە لەگەڵ مودعییە گشتییەکە دەکەم لەسەر تاوان و دەستدرێژییەکانی میریل و وارس تا دۆسییەکەت بۆ بکاتەوە، ئەوەی دەیزانیت قسەیان بۆ بکە.

## شەڕێکی هاوسەنگ و بەرامبەر

فیشر باش بۆی روون کردمەوە کەوا تۆ لە رەوشێکی جیاوازتری، رۆژگارەکەت باش گۆڕاوە، دەکرێ لە دادگا زۆر ئازادانە شکایەت لە میریل بکەیت، باس لە هەموو پێشێلییەکانی سەرت بکەیت، دڵی خۆت بکەیتەوە و داوای مافەکانی خۆت بکەیتەوە، رۆژی سەربەستی تۆیە. لەو تەمەنە کە گەیشتبوومە سی و پێنج ساڵی بۆ یەکەم جار بوو کە هەستم دەکرد لە گۆڕەپانی شەڕێکی یەکسان و بەرامبەرم، دەکرێ بەرگری بکەم، قسەی رەوای خۆم بەبێ ترس بڵێم، هەستم دەکرد هاوشان و پشتیوانم هەیە و منەتم بەکەس نییە، دیارە ئەوەش بۆ من نوێ بوو، من لەوەیاندا رانەهاتبووم.

(ئایتی)ی خوشکم زووتر لە ناو تایفەکەمان رای کردبوو، ئەو هات و یارمەتی دەدام تا دووبارە بگوازینەوە ماڵەکەی دوکتۆر فیشر، ئەو خوشکەم پاش ماوەیەک لەگەڵ رۆبرتی برای میریل کە ئەویش لە تایفەکەمان رای کردبوو دەدۆزێتەوە، هەردوو هەڵاتووەکەی تایفەکە خوشکی من و برای میریل

یەکتریان خۆش دەوێت و ماوەیەک بەیەکەوە دەبن، پاشان پرۆسەی هاوسەرگیری دەکەن و دەگوازنەوە شاری سۆلت لیک و لەوێ بەیەکجاری دادەمەزرێن.

من و کیژەکەم ئەوەمان بەبیر دەهاتەوە کە چۆن کیسە نایلۆنە رەشەکانم تەژی جلوبەرگ دەکرد، ئەوانەمان لە رۆژی هەڵاتنەکە لەجیاتی جانتا بەکار دەهێنا، ئەوەمان کردبوو تا کەس گومانمان لێ نەکات. بە گەڕانەوەمان بۆ ماڵەکەی فیشر کامەران بووین، لەوێ موورتاح بووین، منداڵەکانم زۆر بەختیاربوون، ئەگەرچی ئەوەشیان نەدەزانی کەوا ئێمە جارێکی تر ناگەڕێینەوە ماڵەکەی پێشوومان، هەموومان هەستمان دەکرد لەو هەوارە و لەو رەوشە نوێیەدا هەموو شتەکان گۆڕاون.

باوکم پێوەندیی پێوە کردم، ئەو حەزی دەکرد کێشەکانمان لەگەڵ میریل دوور لە دادگا چارەسەر بکەین، ئەو دەیوت من دڵنیام ئەو جارەیان هاوکارت دەبێت، ئەو زۆر مەبەستیەتی لەگەڵ منداڵەکان بگەڕێینەوە لای ئەو. کە باوکم قسەکانی تەواو کرد من پێم وت:

باوکە دەمەوێ ئەو قسەیە بە میریل بڵێیت من هەرگیز جارێکی تر ناگەڕێمەوە لای ئەو، من شەڕیش دەکەم تا منداڵەکانم وەربگرم و لەوەش دریغی ناکەم. دیارە کەوا باوکم لە ئەساسدا لەگەڵ دەربازبوونەکەمدا نەبوو.

کە میریل بۆ گەڕانەوەم باوکمی بە گژم وەنابوو، لەوەیان سەری نەگرت، باوکیشم نەیتوانی من ئیقناع بکات خۆم و منالەکانم بگەڕێینەوە، ئەوجارە بە تەلەفۆن دەیویست ئارسەری کوڕم هەڵخەڵەتێنێت، هەموو بەرنامە و کۆششەکانی سەری نەگرت، بۆیەش لە کڵێسە ویستبووی سەرکۆنەم بکات و قسەم بۆ هەڵبەستێت، لەوێ وتبووی:

ئەو ژنەی من خیانەتی لە خوا کردووە و دەستی لەگەڵ دەسەڵاتدارەکان تێکەڵ کردووە، گوایە من دەمەوێ منداڵەکانی ئەو برووخێنم و بیانشێوێنم.

کێشەی هەرە گەورەی من لەو ژیانە نوێیەدا پارە بوو، من بەو سەد دۆلار

دەژیام کە وەک یارمەتی کۆمەڵایەتی دەدرایە هاریسۆنی کوڕم، دیارە ئەوەش کەمترین دەسکەوت بوو کە پێویستییەکانم دابین بکات، دوایی پارەی منداڵەکانیان کردە چوار سەد دۆلار. کە میریل هەموو کۆششەکانی بێ سوودبوون وتبووی حەوت لەو منداڵانە منداڵی من نین، سەبارەت بەو ژنە، ئەوە هەرگیز ژنی من نەبووە.

## گیانبازییە گەورەکە

دیارە کەوا من کارم دەکرد بیسەلمێنم ئەو منداڵانە هەموویان منداڵی حەقی میریلن، من ئەوەم دەزانی کەوا لە ناو نووسینگەکەی ئەو لە ماڵەوە بەڵگە و نووسراوی وا هەیە، کە دەسلمێنن ئەو منداڵانە منداڵی میریلن، ئەو بەڵگەنامەی لەدایکبوون و پسولەکانی دەزگای باجی هەبوو، من زووتر دەمویست ئەوانم دەست کەوێت، بەڵام چۆنیان پەیدا بکەم، چی بکەم بۆ ئەوەی ئەو بەڵگەنامانەم هەبێت، ئەوەشم باش دەزانی کەوا نووسینگەکەی ئەو لە ماڵەوە بەردەوام چاودێری دەکرا، کە ئەو دەردەچوو و ماوەیەک لە دەرەوە دەمایەوە، نووسینگەکەی بە وردی پاسەوانی لەسەر دادەنرا. بەڵام من دەبووایە کە هەموو خەڵکەکە دەخەون بچمە ئەو ژوورە داخراوە، باشترین کاتیش سەعات دووی شەو بوو.

چوومە ژوورەوە و لە ناو نووسینگەکەی میریل دەستم گەیشتە دۆسییەکان، لە بەڵگەنامەی منداڵەکانی خۆم دەگەڕام، ئەوەش سەرچڵییەکی گەورە و ترسناک بوو، نەدەکرا ئەو شەوە ئەوە نەکەم، چونکە میریل دوو رۆژ نەدەهاتەوە، ماوەکە باش بوو، بوارەکە سازکار بوو، بۆیەش دوو رۆژەکە باش بوو، چونکە من پسولەکانم دەردەهێنا و کۆپیم دەکردن، دەبوایە شەوی دووەم بیانگێڕمەوە ناو دۆسییەکانی خۆیانەوە، لەو گەڕانەدا گەنجینەیەکی باشم دۆزییەوە. من هەشت جار خۆم لە نووسینگەکە کردبوو، بەوەش هەموو بەڵگەنامەکانم کەوتبووە بن دەست، دوایی ئەوانەم پێشکێشی دەسەڵاتدارەکان کرد و بەوەش بەرگریم لە خۆم و لە دۆزەکەم دەکرد. منداڵەکان هەموویان

یارمـەتییـان وەردەگرت، مـیریل ئەوەی زانی، بەڵام نەیدەزانـی من ئەوەم چۆن چارەسەر کردووە و بەڵگەنامەی ئەوانەم چۆن پەیدا کردووە.

فیشر مـاوەیەک لەبەر سـەرقاڵی کارەکانی نەدەگەڕایەوە مـاڵەوە، ڕۆژێکیـان کە هاتەوە، بە منـی ڕاگەیاند کەوا پۆلیس ناتوانن مـیریل بدۆزنەوە تا فـەرمانی پارێزگـاری منداڵەکـانی پێ ڕابگەیەنن، دەبووایە من تەڵەیەکی بۆ دابنێـمـەوە، بەوەش ئـامـادە دەبـوو، بەڵام من جـورئەتم نـەدەکـرد جـارێکی تـر ئەو پیـاوە ببینمەوە، کە بیرم لە مەسـەلەکەم دەکردەوە مووچڕک بە ناو هەموو دەمارەکانم دادەهات. بۆیەش لە کـۆتایی بڕیاری دیمانـەکـەم لەگـەڵ ئەودا، بەڵام مـەرجم هەبوو کـەوا دیمانەکە لە شـوێنێکی گشـتی بێت، لەو شـوێنە پۆلیسی نهـێنی بوونیـان هەبێت و چاودێریمـان بکەن، سـەرەڕای ئـەوەش دەترسـام، هەر دڵنـیا نەبووم، من حـەڤدە سـاڵ لەگەڵ ئەودا ژیـابووم، دەمزانـی ئەو لەگـەڵ ئەو ژنانەی ڕێزی ناگرن چەند توند و ڕەقکارە.

***

پاش دوو هـەفتـە لە شاری سـۆلت لیک چووینە دادگا، پارێزەرەکـەمان بە ژنە قـازییـەکـەی وت، کـەوا مـیـریل لە بـەرچاوی سێ پۆلیس هەڕەشـەی لـە من کردووەو سێ پۆلیسەکەش لە منەوە نزیک بوون، ئەوەش پارێزەرەکەی مـیریلی سـەرسـام کرد، ئەو ئەوەی نەزانیبوو، ئامادەیی بۆ ئەو تاوانەش نەکردبوو.

کە من منداڵەکـانم لە قوتابخانە لۆکالییەکانی شارەکە دانا، بیتی و ئارسـەر قبووڵیان نەبوو جلی تایبـەتی تایفەکەیان لەبەر بکەنەوە، بیتی بەردەوام یاخی دەبوو، کێشـەی زۆری بۆ من دەنایەوە، من و ئەوانـی تریشـی هـەراسـان کردبوو، هێشـتـا کـاتەکەمـان زۆر نەڕۆیشـتبـوو، کـە تێگەیشـتـم من لەسـەر خاکێکی زۆر پتەو و خۆراگردا نـەوەسـتاوم، بۆیەش قازییەکە پێی ڕاگەیاندم کەوا میریل وەک باوک مـافی ئەوەی هـەیە منداڵەکان ببینێت، دەبێ بەردەوام و بەپێی خشتەیەک سـەردانیان بکات، منیش وتم ئەوەیان لە ڕەوشـی ئاسـاییدا زۆر نۆرمـاڵە، بەڵام لە حـاڵەتی وەک ئێمـە مـیریل جێگەی هـەڕەشـە و ترسـە لەسـەر خـۆم و لەسـەر منداڵەکـانم. لەگەڵ مـیـریل کارنامـەی ئەوە سـاز کـرا کـەوا ئەو هـەفتـانە و بۆ

ماوەی یەک سەعات منداڵەکانی لە یەکێک لە پارکە نزیکەکان و بە چاودێری ڕۆبرتی برای ببینێت.

(دان) و (لینی)ی هاوسەری ئێمەیان بۆ سەر کەنارەکانی دەریا داوەت کرد، ئەوان لە سان دییگۆ خانوویان هەبوو، من و منداڵەکانمان هەرگیز دەریامان نەدیبوو، هەموومان داوەتەکەمان زۆر لا خۆش بوو، بەو داوایە شادومان بووین، بەڵام بیتی کیژم نەیدەویست لەگەڵمانا بێتە ئەو گەشتە، چونکە ئاگەدارمان کردبووەوە کەوا ناکرێ لەسەر دەریا ئەو جلە تایبەتییانەی تایفەکەمان لەبەر بکات، بۆیەش ئەو ئێمەی بە بەدکار پێناسە کرد و ڕازی نەبوو لەوەیاندا هاوشانمان بێت. شوینەکەمان زۆر خۆش بوو، خانووەکە دوو ژووربوو و دەیڕوانییە سەر دەریا، لەبەرئەوەی مەتبەخەکە هەموو جۆرە خواردن و خواردنەوەیەکی تێدا بوو، بۆیەش هیچ پێویستمان بە بازاڕکردن نەبوو.

بەیانییەکەی زوو منداڵەکان جلی مەلەوانییان لەبەر کرد و چووینە سەر دەریا منداڵەکان ماوەی یەک هەفتە زۆر خۆشیان ڕابوارد، لەوێ منداڵەکان دەریایان بینی، سەیری بەرنامەی منداڵانیان لە تەلەڤزیۆن دەکرد و فیلمی کارتۆنی خۆشیان لە ڤیدیۆوە دەبینی، لەسەر کەنارەکە بە لمی سەر ئاوەکە خانوویان بەرز دەکردەوە و قەڵاتیان دەکرد و خۆیان جوان دەخافلاند، بەڵام ترسیان لە دەریاکە هەر هەبوو، چونکە دەریایان نەدیبوو، چوونە سەردەریا بە ڕێنوێنییەکانی تایفەکەمان حەرام بوو.

من بەڕۆژ بەردەوام خەریکی منداڵەکان بووم، شەوانەش لەگەڵ خێزانەکەی دان و لینی دەچووینە لای ئەوان، بەیەکەوە گفتوگۆمان دەکرد، من ئەو جۆرە دانیشتن و ئاخاوتنەمان نەکردبوو، تێکەڵاوی کۆمەڵایەتی لەو جۆرەمان نەکردبوو، بێجگە لە ئێمە و ئەوان کوڕ و کیژەکانیان بە منداڵ و هاوسەرەکانیانەوە هاتبوون، لەو ئاپوورەیەدا چالاکی زۆر دەکرا، هەموومان بە کامەرانی کاتەکانمان بەسەر دەبرد، ئەوەش بۆ یەکەمین جار بوو لە ژیانمدا ئەو جۆرە ژیانە و ئەو کامەرانییە ببینم، بۆیە سەرفراز و دڵشاد بووم.



کارۆلین لە تەمەنی چواردە ساڵییدا



کارۆلین لەگەڵ میریلی هاوسەری



وێنەی باوکی کارۆلین لەگەڵ ژن و منداڵەکانی خۆی



نووسەرەکە لەگەڵدایکی و لیندای خوشکی



کارۆلین لەگەڵ ئارسەری کوڕی




کارۆلین لە راستەوە لەگەڵ تیمی کاراتیە

## ناوەڕۆک

ئەم کتێبە گێڕانەوەی بەسەرهاتی ژنێکە کە لەناو تایفەیەکی تایبەتی باوەڕدار لە ئەمەریکا ژیاوە و پاشان یاخی بووە و خۆی لەوان دەرباز کردووە. راستگۆیانە و بە زمانێکی سادە رۆژانە ئەزیەتەکانی ئەو کۆمەڵەیەی نووسیوەتەوە. ئەو لە ساڵی ١٩٦٨ لەدایک بووە و لەبەر خوێندن دەریان هێناوە و بەزۆر شووی بە پیاوێکی تایفەکەی خۆیان کردووە کە سێ ژنی تری هەبووە و هەشت منداڵی لەو پیاوە بووە. لەو کتێبەدا هەموو لایەنەکانی ئەو کۆمەڵەیەی ئازاریانە هێناوەتە زمان. ئەو تا ساڵی ٢٠٠٣ لەناو ئەو کۆمەڵگەیەدا بە کۆلەمەرگی ژیاوە